بێجگە لەمانە زۆر کەس لە سلێمانی گفتیان دامێ کە ئەم جۆرە نووسراوانەم دەست بخەن. ئەوانیش هەندێکیان مەلان. ئەوانی تریشیان هاوڕێمن.. هاوڕێیەکی تریشم بەڵێنی داومەتێ، کە کۆمەڵەیەکی گەورەم لە هۆنراوەی بوێژەکانی کورد، لە کۆن و تازە، بۆ ڕەوانە بکات.

ئاخ خۆزگە ئەم گفت و بەڵێنانە بەجێ بهێنرانایە!..

### چەپکی گوڵ لە هۆنراوەی کوردی

هەر لە ڕۆژی (18-2-1931)ەوە کە بۆ پشووی نیوەی ساڵ هاتبوومەوە (سلێمانی) خەریکی دەستکەوتنی هۆنراوەی کوردی بووم لە بەرهەمی بوێژە بەڕێزەکانمان. خوداو ڕاستان چەپکێ گوڵم لەو هۆنراوانە دەست کەوت کە تازە دانرابوون. بەرهەمەکان هی ئەم بوێژانە بوون: (ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ)، 0شێخ سەلام)، حاجی تۆفیق)، (بێکەس). پێش ئەمەی لە 7-3-1931دا بگەڕێمەوە بۆ (بەغداد)، هەموویانم نووسییەوە. وا لە خوارەوە هەرسێ بەرهەمەکە دەنووسمەوە، کە بەلای هەموومانەوە بە یەجگار خۆش و گرنگ دادەنرێن.

### بۆچ هەوا ئاڵۆزە؟!

ئەم هەڵبەستەیان هی (ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ)ە کە بە سەر هەرا گەورەکەی (6)ی مشتاخان (ئەیلوول)ی ساڵی 1930دا هەڵیداوە. دەفەرموێ:

(بۆچ هەوا ئاڵۆزە دیسان لێڵ و سوورە ئاسمان؟
گێژەڵووکەی نەگبەتە یا فیتنەیی ئاخر زەمان؟
هەوری قەهرە مەوجی دەریای غەزەب دێنێتە جۆش
یا فوغان و دوو کەڵی ئاهی هەناسە ساردەکان
ڕەنگی گوڵ بۆچی پەڕی؟. بولبول دڵی بۆچی شکا؟.
ناکرێ ئەووەڵ بەهاری شادمانی بێ خەزان
بەفرە مابۆوە لە سەر بەختی ڕەشی خاکی وەتەن
یا بە دەم شەست تیرەوە مێشکی هەژاران پڕژان
بۆ وەتەن سوور هەڵگەڕاوە بەرگی سوورە شین دەکا؟
ڕەنگە ئەشکالی شەهیدی بێنەوامان دا نیشان
وەك برێشکە قرچە قرچی جەرگی سك سووتاوە دێ
یا گڕەی مەترالیۆزو قرمە قرمی تۆپەکان
بۆ شەریفی‌ی کورد خەڵاتە هاتووە سەر تا بە پێ
یا کەلەپچەی دەست و تەوقی گەردن و پێوەندی پان
ئەم هەموو لاوە نەمن نێژران لەم باخچەیە
ڕیشەی کوردایەتی بوو بۆچی بۆمان نێژران؟
جەژنی قوربانە سولەیمانی بە مەسلەخ دانرا
بۆیە ئەم کوردە بە کۆمەڵ چوو لەوێدا سەربڕران
یا کە ئیبلیسی عەلەیهیللەعنە قاوورمە بکا
کۆمەڵی ئیسلام بە جارێ وا دەبێ بکرێن لە جان
بۆچ مەغوول هەڵساوە یاخود دەوری نەحسی جەنگزە؟!.
قەتڵ و عامی ئوممەتە یا حادیسەی ڕۆم و بەبان؟!.
ناوی خۆی نابوو زمانی میللەتی کورد خۆ (ژیان)
بۆچی بەسراوە زمانی وا دەبێ ئاخر ژیان؟!.
بۆ نەبوو قەت ئەهلی حاڵێ؟ بۆ خیرەدمەندێ نیە؟
ئەم وقووعاتە چ بوو؟ بۆچی کرا؟ بیکا بەیان
هەر لە دووی نەگبەت گەڕاوە نەگبەتی تێبفکرە:
کوندەبوو دائیم لە وێرانە دەبەستێ ئاشیان!
جا وەتەن فەرمووی لە پەردەی سینەما وەك سینەما
سوورەتی گیراوە فەرموو بۆت بکا یەکسەر بەیان:
جارێ تەئریخی بنووسە، جا بگۆڕە قافییە
تا بەیانات بنووسی لێت نەبێ حەرفێ نیهان
بێ هەزار ناوی سولەیمانی بە تەئریخ مەشهەدە[1]
ئەم حسابە عاقیبەت ڕۆژێ دەبێ بیکا زەمان
مەقسەدی ئەسڵیی و ئەساسی هەر دۆعاکەی پێشووە
ئێستە تەکراری بکە بەڵکو ببێ مەبحەس ڕەوان
ڕەببی! مووی لێبێ زوبانی پەنجەکانی هەڵوەڕێ!
هەر کەسێ گوڵشەن بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ!

### عوسبەتەول ئومەم

ئەمەیش هۆنراوەی بوێژی بە ناوبانگ (شێخ سەلام)ە کە هوروژمی بردۆتە سەر (کۆمەڵی گەلان=عصبە الامم)، لە سەر ئەوەی بەڵێنەکەی خۆی لەگەڵ (نەتەوەی کورد)دا نەبردۆتە سەر. ئەم هۆنراوەیەیش لە ساڵی 1930دا گوتراوە. چونکە ڕۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمە بە ئافرەت و پیاوەوە، گەلێك سکاڵانامەو تەلگوراف و نامەیان پێشکەش بە کاربەدەستانی (کۆمەڵی گەلان)و (ئینگلیز)و (عیراق) کرد، بۆ سەندنەوەی مافی ڕەوای (نەتەوەی کورد) بەڵام هیچی لێپەیدا نەبوو!.. بوێژی بەڕێزیش (شێخ سەلام) کە یەکێك بوو لە خەباتکارانی ئەو سەردەمە داخی دڵی خۆی بەم جۆرە بە (کۆمەڵی گەلان) ڕشتووە:

بەشی یەکەم
عوسبەتول ئومەم کۆمەڵی گەورە
پڕ پێچو پەنا بەفێڵ و دەورە
لە دوور بە دووڕۆ بۆ حەقی کوردان
تەکانت دەدا خۆت دادەشرنگان
بەجۆش و کوڵ بووی بۆ کوردی هەژار

[1] مەشهەد (مشهد) بە ژمارەی ئەبجەدی دەکاتە (349). هەزاریشی بچێتە سەر دەکاتە (1349)ی کۆچی کە مێژووی هەراکەیە.

دەتگوت ئەم قەومە دەکەم ڕستگار
لوجنەی ئینتیداب موڕەخخەسی هات
گەڕا کەشفی کرد سەرانسەر وڵات
ئەگەر ڕاست دەکەیت هەڵی سووڕێنە
بەس بە سیاسەت بمانخنکێنە
کۆمەڵی گەورە جێگەی مەکرو فەن
کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن
* * *

بەشی دووەم
خۆ تۆ وەسی بووی ئەقوام بوون هەتیو
دەمی کوردت کرد بە تەڵەی تەقیو
نایەیە ئاسۆی ناوی کورد بردن
لایق بە خۆتە پێچو ناو ئاخن
تاتۆ بوویت گەڕایت بە ناوماندا
دەستمان گرتبوو بە کڵاوماندا
مەنشەئی فیتنە کۆمەڵی تەزویر
وا دەدەی حەقی ئەقوامی سەغیر؟!
بۆچ کوردت فەوتاند بەم بەندو باوە؟
ئێستە لە (جەنوە) خۆت مەڵاس داوە؟
ناترسی تەئریخ لەعنەتت بکەن؟
کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن!
* * *

بەشی سێهەم
خوێنی میللەتی کورد دەڕژێنێ
بۆ ئەمەی نەختێ تورك بترسێنێ
لە سولەیمانی جاددەی بەرسەرا
بە خوێناوی کورد ئاووڕشێن کرا
چۆن عاجز نابی لەم خوێن ڕشتنە؟
لەلای تۆ هەڵبەت حوقووق کوشتنە؟
مەعدەنی فیتنە کارخانەی میحەن
کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن!

قەدری میللەتتان

بنکەی هۆنراوەکە هی (حاجی تۆفیق)ی پیرەمێردە. لە ساڵی 1930دا دایناوە. هورۆژمی بردۆتە سەر ئەو کۆمەڵە کەسانەی چووبوونە بەردەم خونکاری عیراق کە ناویان نابوون (وەفدی کوردستان). کەچی لەڕاستیدا فەرمانداری سولەیمانی بە زۆر ناردبوونی. ئەمانە لەو کەسانە بوون کە لە ڕۆژی 6-9-1930دا لایەنی فەرمانڕەوایی عیراقیان گرتبوو، لە ترسی ئەوەی زیان بە بازرگانییەکەیان بگەیێنێت، چووبوونە ناو کۆڕی هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەلەوە، کە گەلی کورد خۆی نەیدەویست بەشدار ببێت لەو هەڵبژاردنەدا: تا بە مافی نەتەوایەتی خۆی دەگات. هۆنراوەکە پێنج خشتەکییە. سێ تاکی سەرەوەیان هی بوێژی بەناوبانگ (فایەق بێکەس)ە. دوو تاکی خوارەوەیان هی بوێژی گەورەی ناودار (حاجی تۆفیق)ە:.

قەدری میللەتتان بە جارێ شکاند
نە حەیاتان ما نە ناوو نیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەر شان
(وەفدی کوردستان میلەت فرۆشان)
(هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان)
حاجی توتنەکەت مادام فرۆشرا
قیروسیا لە سەد کوشتنو هەرا
دەخیلە هەڵسەو ڕێکەوە خێرا
(دەسکێ لەو گوڵەی باخچەکەی سەرا)
(کە بە خوێناوی میللەت ئاو درا)
تاقمێ ڕێك خەن وا بە پەرلاقی
بە بەزمو ڕەزمو شەرابو ساقی
بۆ ئەوەی بکەن دەفعی مەراقی
(بیبەنە بەردەم عەرشی عیراقی)
(بڵێن یار باقیو هەم سوحبەت باقی)!
نە یارانتان دی نە با ئەی فەقیر
نە لاوان کوژران بە سونگیو شەست تیر
نەپێی نازداران خرایە زنجیر
(پەردەو تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر)
(بڵێن دوای کوشتار هێشتا تۆی دڵگیر)
هاوار بە ماڵم چیمان پێکرا
لە چارەکێکدا سەدمان لێخرا
هێشتا خەڵاتیان دەکەن بە بەرا
(دەك خەجاڵەت بن لە ڕۆی مەحشەرا)
(ئێمەیش خاکی غەم دەکەین بە سەرا)
قەت وا تێمەگەن چاومان شکاوە
کوشتنو بڕین دائیم بۆ پیاوە
لە ناودۆشەکدا کەی حەق سێنراوە؟
(خەیاڵتان خاوە(کورد) نەفەوتاوە)
(بەراتی نەجات بە خوێن نووسراوە)
میللەت مەتینە عەزمی نانەوێ
لە غایەی بەرزی خۆی هەر ناکەوێ
لە خەوا (حاجی)[2] پێی ووتم شەوێ:
(من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش دەوێ)
(موژدەی شەفەقی لێدەردەکەوێ)

**سەرچاوە:**

**خەباتی ڕۆشنبیران، شاکر فەتاح، ساڵی (1984)، بەغداد، چاپخانەی (الحوادث).**

---

[2] فایەق بێکەس، مەبەستی لە (حاجی تۆفیق)ی پیرەمێردە، کە ئەم هۆنراوانەی گوتووە.

# پێگەیشتنی مەلا کاکە حەمە

(مەلا کاکە حەمە) کوڕی (حاجی سیف الله) کوڕی (حاجی حبیب الله) کوڕی (مەلا میر مەلك)ە. لەساڵی 1884دا لەسلێمانی لەگەڕەکی (دەرگەزێن) لەدایك بووە. (حاجی حبیب الله) سەرەکی هۆزی (تاڵشی دۆڵاییین) بووە لەکوردستانی ئێراندا. بۆ ئەمەی گەلەکەی خۆی ڕزگار بکات لەدەست زۆرو ستەمی فەرمان ڕەوایی ئێران، چووە بەگژ لەشکری ئێراندا. لەپاش شەڕێکی خوێنیین شکاوە. خۆیو کوڕەکەی (سیف الله) کە ئەوساکە لەتەمەنی پانزە ساڵیدا بووە، بەپارەیەکی زۆرەوە خۆیان دەربازکردووە. (سیف الله)ی لە(سابلاخ)دا شاردۆتەوە. خۆیشی چووە بۆ (حج). بەڵام لەوێ گیانی پاکی بەخاك سپاردووە. (سیف الله)یش کە بەوەی زانییوە کۆچی کردووە بۆ شاری (سلێمانی). لەوێ (مفتیی چاومار) برازای خۆی لێ مارە کردووە کە کچی (مەلا محەمەدی چاومار) بووە. ئەم ئافرەتەیش وەك مێردەکەی زانا بوو، ناوی (مەلا فاتم) بوو. بەهەردووکیان بە (مەلا کاکە حەمە)ی کوڕیان خوێندووە. (مەلا کاکە حەمە) نووسراوە ئایینییەکانو زمانی فارسیو عەرەبیی لەسەر دەستی مەلاکانی (سلێمانی)و (سنە)و (سابلاخ)و (سەقز)و (سەردەشت)و (کۆیە)دا تەواو کردووە. کاتێ کە (سیف الله)ی باوکی مردووە، تەمەنی سیانزە ساڵ بووە. جێگەی ئەوی گرتۆتەوەو وەك ئەویش دەستی کردووە بە بازرگانی. لەتەمەنی پانزە ساڵیدا دایکی بە زۆر ژنی پێ هێناوە. بەڵام (کاکە حەمە) لەپاش پێنج ساڵێك خۆی لە دەست بازرگانیوماڵو ژنو منداڵو دایكو خوشكو برا ڕزگار کردووەو چۆتە دەرەوە بۆ کوردستانی ئێرانو هاتۆتەوە ناو کوردستانی عیراق بۆ خوێندن. لە (کۆیە)دا لەسەر دەستی (مەلا بهاءالدین)دا کراوە بە (مەلا). شایی بۆ کراوەو پاداشیشی پێ بەخشراوە. ئینجا گەڕاوەتەوە (سلێمانی) بۆ ناو ماڵو منداڵی خۆی.

بەم ڕەنگە (مەلا کاکە حەمە) لەخێزانێکی خوێندەوارو دەوڵەمەندو دەستەڵادار، بەڵام کۆست کەوتوو و ئاوارە کەوتۆتەوەو لەناو ئەوانو مزگەوتەکانی کوردستاندا گەورەبووەو پێگەیشتووە. ئەو کاتەی بووە بە (مەلا) تەمەنی نزیکەی بیستو پێنج ساڵان بووە.

**ڕەوشتو ژیانو سروشتی مەلا کاکە حەمە**

(مەلا کاکە حەمە) لەهەرزەکارییدا لاوێکی باڵا ناوونجیی داڕێژراوی توندو تۆڵی شۆخو شەنگ بووە. لەسەر ڕاستی توندو



تیژبووە. کۆی نەکردۆتەوە لە کەس. لەچاوەکانیا تروسکەی ڕاستی پەرستیو کار دروستیو خواناسی پڕشنگی ئەدا. کە بەتییلایی چاو تەماشای پیاوی ئەکرد وەك پڵنگێکی بە چنگ سامی ئەخستە دڵی دانیشتووانەوە. بەڵام پڵنگێکی دڕندە نا، پڵنگێکی خوێندەوار. پڵنگێکی خواناسیو نیشتمان پەروەر، کە لەسەر مافی گشتی باکی نەبوو یەخەی هەموو کەس بگرێ. لەڕاستیدا (مەلا کاکە حەمە) تا ژیا وەك پڵنگێك هوروژمی ئەبردە سەر زۆرداریو نەخوێندەواریو هەژاریو نەخۆشی. لەپێناو ئازادکردنی کورددا، لەو چوار دەردە، هەموو سەرو سامانو سەروەتو کامەرانیو گیانی خۆی بەخت کرد. لەژین نامەیەکی خۆیدا کە لە ڕۆژی 1958/1/11دا نووسیویە، ئەڵێ: (..جا من لە حەوت ساڵیمەوە هەموو کاتێ میکرۆبی باپیرم لەمێشکا بوو.. بەو ماخولیایەوە نەمتوانی لەشاردا بژیم. ڕام کردە لادێ، کە کەمتر هێزی بە سەرەوە بوو. دووبارە هەموانم بەجێ

هێشتەوە. کە ئەو وەختە عومرم (25) ساڵ بوو. لەپاش بەینێ گیرام بۆ عەسکەری. لە (بێروت)و بەغداد)و (سامرا)دا تا (هودنە) دەوامم کرد. دوو بارە نەچوومەوە شار. هاتمەوە لادێ..).

(مەلا کاکە حەمە) گیانێکی شۆڕش گێڕانەی هەبوو. ئەو ئەم گیانەی لەباپیریەوە وەرگرتبوو. بێگومانم لەوەی کە باوکی چیرۆکی سامناکی ئەو شەڕو شۆڕو دەربەدەری‌و ئاوارەییەی (حاجی حبیب الله)ی باوکی‌و خۆی بۆ گێڕاوەتەوە. بۆیەکا هەر لەمناڵی‌یەوە، تۆوی نیشتمان پەروەری چۆتە دڵیەوە. هەروەها ئارەزووی خوێندەواری‌و خۆ پەروەردە کردنیشی هەر لەدایکی‌و باوکی‌و گیانی باپیرانیەوە وەرگرتووە. لەڕاستی‌دا ئەم بنەماڵەیە هەر لەسەردەمی (مەلا میرمەلك)ەوە تا ئێستا هەر بەخوێندەواری‌و خانەدانی‌و ڕەوشت‌و سروشتی بڵندەوە ناویان دەرکردووە. (حاجی سیف الله)ی باوکی (مەلا کاکە حەمە) وەك دەوڵەمەندێکی مەلای بازرگانی، سەر ڕاست‌و چاکە خوازو مەرد ناوبانگی ڕۆیشتووە. (مەلا فاتم)ی دایکیشی وەك ئافرەتێکی خوێندەواری زاناو سەر بڵند، خوێندنی فێری سەدان کەس لە کوڕان‌و کچانی سلێمانی کردووە.

جا (مەلا کاکە حەمە) ئەو ڕەوشت‌و خووە سەر بڵندانەی کە هەیبوو، لەبنەماڵەکەی خۆی‌و خێزانەکەی خۆیەوە وەرگرتبوو.

(مەلا کاکە حەمە) پیاوێکی دەروون ئازاد بوو. ئازاو بێ باك بوو، چاکە خوازو خواناس‌و کارگوزاربوو. خۆ بەخت کەربوو. لێبوردەو دڵ فراوان‌و سەر ڕاست‌و دڵسۆز بوو، نە لە خواردندا، نە لە پۆشیندا، نە لە سایەو مایەدا بەتەنگ خۆیەوە نەبوو. چ بۆ دادگەریی سلێمانی، چ بۆ مفتێتی سلێمانی، دووجار ویستیان دای بمەزرێنن، بەرپەرچی‌دانەوە، چونکە ئەو تەنیا یەك ئامانجی هەبوو کە ئەویش هەر وەك خۆی ئەڵێ: (خزمەتی زانیاری کەساس‌و هیچ دەست نەکەوتووەکان‌و هیچ نەزانەکان بوو). ئەمیش (مەلا کاکە حەمە)یە کە ئەڵێ: (ئامۆژگاریم، جگە لەواجباتی دینی ئەوەیە؛ بەخوێندن ئینسان لەباقی ڕۆحلەبەر جیا ئەکرێتەوە. وە نابێ خوێندن بۆ ئەمە لای ببێ کە خۆی بەخەڵق بژێنێ، یان ببێتە مەئمور، حوریەتەکەی بفەوتێ، ئەبێ بۆ ئەوە خەریك بێ:

فێری زانیاری و صنعت ببێ، تا ئەتوانێ. ئەوسایە خزمەتی قەومی کەی بکات. هەروەها ((مەلا کاکە حەمە))یە کە ئەڵێ: کەسم خۆش ناوێ ئەوانە نەبن کە لەسەر فکری من بن. ئەوانەی خزمەتی بیرەکەم)) بکەم ڕۆحم فیدایانە.. ئەمەوێ خزمەتەکەم دوای مردنم لاسایی بکرێتەوە. ئەگەر بیکەن نامەوێ بناسرێم.. یا بۆنی بۆ خۆ هەوڵدانی لێنەیێ!). کەواتە ئامانجی (مەلا کاکە حەمە) کوردایەتی‌یەك بووە کە لەسەر بنچینەی (زانست)و (هونەر)و (پیشەسازی)و (خواناسین) دابمەزرێ. جا هەر ئەم ئامانجە بوو کەپاڵی پێوەنا تێکەڵ بەشێخەکانی (کریچنە)و (گۆپ تەپە) ببێ.. تا هێزو دەسەڵاتیان بەکاربهێنێ بۆ کەڵکی کوردەواری.. ماوەیەك لای (شێخ قادری شێخ کەریمی کەس نەزان)و (شێخ مەحمودی گەورە)دا کرا بەدادگەر واتا (قازی)ی (سەنگاو). کاروباری لادێ کەی بۆ کارگێری لادێی سەنگاو (شێخ قادری گۆپ تەپە) هەڵ ئەسووڕاند. پاش تێکچوونی (شێخ مەحمودی گەورە)یش لەگەڵ ئینگلیزدا کرا بەدادگەری ناوچەی (قەرەداغ). هەمیسان کاروباری هەموو ناوچەکە (مەلا کاکە حەمە) سەرپەرشتی بۆ (شێخ قادری گۆپ تەپە) ئەکرد. بەڵام لەساڵی 1925دا (شێخ عبدالقادر) گیراو دەربەدەر کرا. (مەلا کاکە حەمە)یش تا چوار مانگ لە سلێمانی‌دا خرایە ژێر گیروگازو لێپرسینەوەو دەس بەسەری‌یەوە. تا بارمتەی (30.000) ڕوپیەی بەفەرمان ڕەوایی نەدا، بەرەڵڵا نەکرا.. (مەلا کاکە حەمە) لەشار دەرباز بووەوە. ئەم جارە چووە ناو تیرەی هۆزەکانی جافەوە. تا دوو ساڵی خشت لەگەڵ ئەواندا گەرمیان‌و کوێستانی کرد. هەر لەنزیك (باقوبە)وە تا نزیك (سەقز) لەگەڵیاندا گەڕا. (مەلا کاکە حەمە) لەم ڕووەوە ئەڵێ: (جا بە هەموو جۆرێ خەریك بووم.. بەنفوزی ئەوانیش هیچ نەکرا. جا قەراری ئاخری‌و باوەڕم هاتە سەر ئەوە کە قەومەکەمان تا لەسەد شەستی خوێندەوەاری تەواو نەبێ، کەوابێ؛ زانینە کە یان لە خۆش ڕابواردن‌و خۆپیشان داندا خەرج نەکەن، بە هیچ نابین.. جا مجبور بووم کە ژیانم بەدەرس وتنەوە خەرج بکەم، بە وانەی کە لە دەرەوەن‌و دەرسیان دەس ناکەوێ.. لەو وەختەوە خەریکی ئەوەم. ئەویش بۆ حوریەت فرۆشتن بەمعاش‌و، خۆ بە مەلا مەشهور کردن‌و خۆ ژیاندن بە خەڵق نا.. بەڵێ ئاخ، سەد ئاخ! وتم نامرم.. ئەما ئەم مرێنن!). پاش ئەوە (مەلا کاکە حەمە) ئەڵێ: (عیلمە دینیەکان هەموو فێربووم‌و خوێندومن. بەو هێزەوە لەمەدەنیەکانیش ئەوانە فێربووم کە کتێبم).

لە ڕاستی‌دا ئەمە هەر لەپیاوێکی ڕاستی پەرستی خواناسی زانای وەك (مەلا کاکە حەمە) ئەوەشێتەوە، کە لە هەڕەتی هەرزەکاری‌دا، خۆی لەژن‌و منداڵ‌و دایك‌و خوشك‌و براو دوکانی بازرگانی‌و سامان، دوور بخاتەوە، هەر بۆ ئەمەی خوێندنەکەی خۆی تەواو بکات‌و خۆی بکات بە (مرۆڤ). ئەو خوێندەواری‌یەی خۆیشی چوار دەردەکەی، کە بریتین لە (زۆرداری)و (هەژاری)و (نەخۆشی)و (نەخوێندەواری).

لێرەدا (مەلا کاکە حەمە) پەنجە بۆ ژیانی خۆی ئەکێشێ لەشاری (سلێمانی)دا کە ئەڵێ: (دونیام لا بوو بووە زیندان.. لەو زیندانە فرارم کرد، بەناوی فەقێتی‌یەوە بۆ ناو کوردستانی ئێران).

کاتێکیش کە (مەلا کاکە حەمە) ئەڵێ: (بیری کەس ناکەم. سەر لە کەس نادەم. کەس سەرم لێ نادات. لای زۆر تری خەڵق وایە هیچ کەسم نیە. هەروایان دەیبووم!.) بیر بەلای ئەوەدا ئەچێ کە پیاوێکی دڵ ڕەق بووەو خێزان‌و کەس‌و اکاری خۆی کە نەفت کردووە.. کەچی کە چاوێکم خشاند بەنامەکانیا کە لەناوەند خۆی‌و کوڕە گەورەکەیا (مەلا جەلال) هاتوون‌و چوون، ئەوپەڕی نازگرتن‌و خۆشەویستی‌و ڕێزگرتنیان تیا هەست ئەکرێ. (مەلا کاکە حەمە) چاك‌و چلۆنی‌ی بۆ هەموو ئەندامانی خێزانەکەی خۆی نووسیوە.

وێنەی لەگەڵدا گرتوون، قسەی خۆشی بۆ نووسیون. دڵی داونەتەوە کە لێی نەڕەنجێن لەبەر لێنەپرسینەوەی و کەم تەرخەمی لەگەڵیاندا.. داوای بەخشینی لێکردوون. بۆ ئاگر هاتبێ، زوو گەڕاوەتەوە بۆ لای خوێندنگاو شاگردەکانی بۆ لای نووسین و نوسراوەکانی.

ساڵانی وایش بووە، خێزانەکەی بردووە بۆ لای خۆی، یاخود هەندێکیانی بردووە بۆ لای خۆی.

(مەلا کاکە حەمە) سێ ژنی هێناوە. لەمی یەکەمیان دوو کوڕو دوو کچی بووە. لەهی دووەمیان دوو کوڕی بووە. لەهی سێهەمیان سێ مناڵی بووە. بەڵام لەمانە هەموویان هەر کوڕێك و کچێکی ماوە، لەگەڵ نەوەکانی. (مەلا کاکە حەمە) کە ژنی یەکەمی دەمرێ تا چەند ساڵێکی دوورودرێژ بێ ژن ئەمێنێتەوە ئینجا ژنی دووەمی لە (قەرەداغ)دا پێ ئەهێنن!

کە ئەمیش ئەمرێ ئینجا ژنی براکەی خۆی، خوا لێخۆشبوو (مەلا نوری) مارە ئەکات، هەر لەبەر ئەمەی کە پاداشتی براکەی و براژنەکەی بداتەوە، کە کاتی خۆی چاودێری مناڵەکانی ئەویان کردبوو. ئەیویست چاودێری ژنەکەو هەرسێ کچەکەی (مەلا نوری)ی برای بکات.

بێجگە لەمە (مەلا کاکە حەمە) ئەگەر پشت ئەستوور نەبوایا بەدایکی و خوشکی و براکانی و ئەو سامانەی کە بۆی بەجێهێشتبوون چۆنی ئەتوانی ئەو مناڵانەی خۆی وا بەرەڵڵا بکات و لێیان نەپرسێتەوە؟!.

لەگەڵ ئەمەیشدا ئەو ئامانجە پیرۆزەی (مەلا کاکە حەمە) بۆ خۆی دانابوو، کە (پەروەردە کردن)و (فێرکردن)ی مناڵانی بێ خاوەنی نەتەوەکەی خۆی بوو، نەك ئەو، هەر زاناو ڕاستی پەرست و خواناسێکی تریش لەجێی ئەو بوایە، هەر ئەوەندەی ئەوی لەدەس ئەهات، کە بیکات بۆ خێزانەکەی خۆی، پیاوی وا کە خۆی لەبیر بچێتەوەو خۆی لەهەموو خۆرشتێکی نایاب و جل وبەرگێکی جوان و سایەو پایەو مایەیەك، لەهەموو ناوبانگێك بێبەش بهێڵێتەوە، چۆن ئەبێ کەسێکی تر گلەیی لێبکات، لەسەر کەم تەرخەمی، با خێزانیشی بێ، لەڕاستیدا (مەلا کاکە حەمە) هەموو هێزو تواناو بیرو هۆشێکی خۆی خستبوە سەر خوێندنگاکانی و نوسراوەکانی کە (36) ساڵێکیان پێوە خەریك بووبوو. لەبەرئەوە نەماوەی بۆ مابووەوە، نەدەستیشی ئەپەرژا خەریکی هیچی تربێ. وەك لەمەودوا ڕۆشنی ئەکەمەوە.

### مەلایەکی شۆڕشگێڕ

لەساڵی (1925)ەوە تا ساڵی (1961)، واتا نزیکیەی سی وشەش ساڵی خشت، (مەلا کاکە حەمە) ڕەنجی داو، کۆششی کردو، خەباتی کرد لەناو هۆزەکانی (جاف)و (داودە)و (زەنگەنە)و دێهاتەکانی تری کوردستانی عێراق و ئێراندا، هەر بۆ ئەمەی (خوێنەواری) بەناو (کوردەواری)دا بڵاوبکاتەوەو نەتەوەکەی خۆی، هەروەکو خۆی لەهەموو شوێنێکا ئەیگوت: (لەڕیزی گیان لەبەرییەوە بگوێزێتەوە بۆ ڕیزی مرۆڤایەتی، تا بەپیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانییەوە، کە لەسەر بنچینەی زانست و هونەر دامەزرابێ، ژیانێکی مرۆڤانە بژین). جا بۆ پێك هێنانی ئەم مەبەسە (مەلا کاکە حەمە) دوو ڕێگای شۆڕشگێڕانەی گرت. یەکەم: (44) نوسراوی بۆ شاگردەکانی خۆی بەزمانی کوردی ئامادەکرد. ئەمانە هەندێکیانی لەزمانی عەرەبییەوە گۆڕیبووە سەر زمانی کوردی. هەندێکیشیان خۆی دانابون. هەندێکیان هی خوێندنی ناو مزگەوت بوون، هەندێکیشیان هی خوێندنگاکانی فەرمان ڕەوایی بوون. جا هونەری (مەلا کاکە حەمە) لەوەدابوو، کە ساڵانی خوێندنی لەدە پانزە ساڵەوە کەم کردبوەوەو گەیاندبوویە چوار، پێنج ساڵ بەمەرجێ، بارستایی خوێندەواری شاگردەکانی لە بارستایی شاگردێکی خوێندنگای (ئامادەیی)، بەڵکو بەرەو ژوور تریش کەمتر نەبێ. هەروەها لەبارستایی خوێندەواریی شاگردێکی ناو مزگەوتیش کەمتر نەبێ. لەڕاستیدا بارستایی خوێندەواری شاگردەکانی خوێندنگاکانی (مەلا کاکە حەمە) لە بارستایی خوێندەواری هەردوو جۆرە خوێندنگاکانی (کۆن)و (نوێ) باشتربوو. چونکە ئەم خۆی بە هەموو شاگردێکیەوە ماندوو ئەکرد. نەك هەر ئەمە، کە زانیارییان بخاتە مێشکەوە، بەڵکو بەڕەوشت و خویەکی خواناسانەو نیشتمان پەروەرانەو مەردانەیشەوە ڕای ئەهێنان. خەمی خواردن و جل وبەرگ و تەندروستی و خۆش ڕابواردو سەروەت و ڕێك وپێکی و پاك وخاوێنی و نوستنی ئەخواردن و، لەسەر باسایەکی ڕاست و دروست ژیانیانی ئەبرد بەڕێوە.

لەهاویناندا کە کاتی پشوودانیان بوو، (مەلا کاکە حەمە) کشتوکاڵی بەشاگردەکانی خۆی ئەکرد، ئاژاڵی پێ بەخێو ئەکردن، بەرهەمی ئەو ڕەنجانەیشی بۆ خۆی و شاگردەکانی خۆی بەکار ئەهێنا، جێگای نوستنیانی بەخۆیان ڕائەخست، چێشتی خۆیانی بەخۆیان لێئەنا، جلی خۆیانی بە خۆیان ئەشوشت، پاك و خاوێنی خۆیانی بە خۆیان پێك ئەهێنا. هەر ڕۆژە یەکێ:یان بانگی ئەدا هەر ڕۆژە یەکێکیان پێش نوێژی بۆ هەموو شاگردەکان ئەکرد گۆرانی و بەزم و ڕەزم و ئاهەنگیان هەبوو. گەشت و سەیران و وەرزش و سەربەستیشیان هەبوو. خوێندنەوەی وتاری دروست و سەربەستیشیان هەبوو. بەکورتی خوێندنگاکانی (مەلا کاکە حەمە) شاگردیان ئەکرد بەپیاوێکی ڕۆشن بیری کورد پەروەری وریا و چست و چالاك، کە هەر پشت بەخۆی ببەستێ. کە سەری بەندەییش بۆ هیچ کەسێك و بۆ هیچ زۆردارێك و بۆ هیچ گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەیەك دانە نەوێنێ! کە ژیانێکی پڕ لەپاکی و چاکی و کامەرانییش بژی.

جا ئەم خوێندنگایانەیش ڕێگای دووەمی شۆڕشگێڕانەی (مەلا کاکە حەمە) بوون. پێویستە ئەمەیش بڵێین، کە (مەلا کاکە حەمە)

لەپێناو گەیشتن بەم ئامانجە پیرۆزو بەرزەیدا گەلێك كۆسپ‌و بەرهەڵستی ئەهاتە بەردەم. گەلێك ئەرك‌و ئازاری ئەچێشت، گەلێك زیانی لێئەكەوت، بەڵام هەرگیز ورەی بەر نە ئەدا، كۆڵی نە ئەدا، تا ئەهات زۆرتر خەباتی ئەكرد. زۆرتر گەشەی ئەدا بە (نووسراوەكان)ی‌و بە (خوێندنگاكان)ی.

ڕەوشتی وا بوو، هەر چەند ساڵە لەگوندێك دا ئەمایەوە، جاری وا هەبوو، ژمارەی شاگردەكانی ئەگەیشتە پەنجا، شەست شاگرد، كە فرمانی لەو گوندەدا تەواو ئەبوو، ئینجا ڕووی ئەكردە گوندێكی‌تر كە بەش بڕاو بووبێ لەخوێندنگای فەرمان ڕەوایی یاخود مزگەوت.

(مەلا كاكە حەمە) لەبەرامبەر ئەم هەموو ڕەنجەدا سەری خۆی بەرز ڕائەگرت، پاداشی لە كەس داوا نە ئەكرد. خۆی‌و شاگردەكانی خۆی بەو نانە ئەژیاند كە بەڕەنجی شان‌و خوهی[1] ناوچەوانی خۆیان پەیدایان ئەكرد، یاخود بەو یارمەتی‌یەی كە گوندی‌یەكان، بەئارەزووی خۆیان ساڵەو ساڵ لەبەرهەمەكانی خۆیان ئەیاندانێ. ئەو ئەیویست شاگردەكانی خۆی وا ڕابهێنێ كە وەك خۆی دەربچن. وەك خۆی خۆبەخت كەرو دڵسۆزو نیشتمان پەروەرو خواناس بن. ئەیویست ئەوانیش خۆیان بۆ بڵاوكردنەوەی خوێندەواری‌یەكی ڕاستەقینە تەرخان بكەن، بۆ كەڵكی كوردەواری‌و ئاوا كردنەوەی كوردستان.

بێجگە لەخوێندنگا بەڕێوەبردن‌و نووسراودانان‌و نووسراو گۆڕین (مەلا كاكە حەمە) چالاكی‌یەكی تریشی ئەنواند. ئەویش ئاڕاستەكردنی دانیشتوانی گوندەكان‌و گەورەكانیان بوو، بۆ كاروباری چاك‌و پاك بۆ كەڵكی هەموان. هەروەها تا ئەندازەیەكی گەورەیش لەكاری خراپ‌و زیان بەخش پەشیمانی ئەكردنەوە. بەم ڕەنگە (مەلا كاكە حەمە) شۆڕگێڕانە ئەبزوتەوە. وەك چرایەكی پڕشنگدار مایەوە، لەناو دێهاتەكانی كوردستاندا مێشك‌و دڵ‌و دەروونی (ڕەش)و (ڕووت)و (دەسەڵاتدار)و (هەژار)و (دەوڵەمەند)ی نەتەوەكەمانی ڕۆشن ئەكردەوە. كەچی لەگەڵ ئەوەیشدا نەی ئەویست بناسرێ، یاخود ناوبانگی بۆ دەربكرێ. یاخود بۆسایەو پایەو مایە بگەڕێ. چونكە (مەلا كاكە حەمە) نیشتمان پەروەری‌یەكەی لەخواناسی‌یەكەیەوە وەرگرتبوو. هەرچی‌یەكی ئەكرد، بۆ خوای ئەكرد، پاداشی لەكەس نەئەویست. لەخوای ئەویست. كە لەپێناو ئەم كردەوە ڕەنگینانەیشیدا گیروگرفتێكی ئەهاتە بەرو، دەردو ئازارێكی تووش ئەبوو، ڕووی ئەكردەوە خواو داوای ڕێگا پێشاندانی لێئەكرد، بۆ ئەمەی ئەو فرمانە گەورەیەی خستبوویە سەرشانی خۆی باشتر بەڕێیەوە ببات.

جارێكیان لەدێیەك لەدێهاتەكانی (داوودە) ڕەنجی چوار ساڵ‌و سێ مانگی بەبا چوو! شاگردەكانی لێی تەكینەوەو بڵاوەیان لێكرد!.

[1] خوە=ئارەقی لەش.



(مەلا كاكە حەمە) لەپاش سكاڵایەكی دوورو درێژ كە بەهەناسەیەكی ساردەوە نووسیویە، لەژێن نامەكەیا، ئەڵێ:

(لەبەرئەوەی زانرا ئەمانە نابنە ئەوەی معاشیان دەس كەوێ زەكات‌و سەرفترەیان بدرێتێ، سەرقەڵەمانە وەرگرن، تێكیان دا. منیشیان لەغایەكەم مەحروم كرد! سەرگەردانیان كردم!. پەنا بەخوا..).

ئەمە لەساڵی 1944دا ڕوویدا. كەچی (مەلا كاكە حەمە) زۆری پێنەچوو، چووە گوندێكی‌تر، سەرلەنوێ خوێندنگایەكی تری دامەزراندەوە!.

### شاه كارەكانی مەلا كاكە حەمە

(مەلا كاكە حەمە) بۆ شاگردەكانی ئەم نوسراوە كوردی‌یانەی ئامادە كردووە. هەندێكی كردووە بەكوردی. هەندێكیشی بەكورت كراوەیی‌و پوختەیی گۆڕییوەو داڕشتووە بەكوردی. هەندێكیشیان داناوەو داهێناوە بە كوردی[2].

[2] : ئەمە لەنوسراوێكی خۆی وەرگیراوە. خۆیشم زۆربەی ئەم نوسراوانەم لای كوڕەكەی (مەلا جەلال) دیوە.

1.تفسيری قرآن به كورتی هەر سێ جزمەكە.

2.منهاج لەسەر وتەی إمامی (نووی) بەتحقيقاتی پێویستی (إبن الحجر)ەوەو هیتر لە مذهبي (شافعی)دا. ئەمە (800) لاپەڕەی گەورەیە.

3.نحوی عربي.
4.صرفي عربي.
5.وضع.
6.إستعارة لە علمي مطقدا.
7.إيساغوجي.
8.شمسية.
9.گلنبوی برهان.
19.گلنبوی آداب.
11.شرحی عقائدی ملا سعد.
12.جمع الجوامع.
13.مختصر لە علمي بلاغت.
14.تلخيصی تهذيب الكلام.
15.تشريح الأفلاك.
16.رسالەی حساب.
17.جغرافيای عمومی.
18.تأريخی عمومی.
19.قواعدی كوردی.
20.معلوماتی مدنيه.
21.خوو و ڕەوشت.
22.تەندروستی (صحه).
23.علمی دين.
24.مبادئی هندسه.
25.كيمياء.
26.قانونی عقوبات.
27.قانونی اصولی محاكمات.
28. = عشائر.
29. = اساسی.
30. = تسويه.
31. = زراعت.
32. = عقر.
33. = لزمه.

34.ئەلف و بێی كوردی.. ئەم ئەلف و بێیە زۆر سەیرە زۆر ئاسانیش فێر ئەكرێ. خۆی دای هێناوە. لەسەر بنچینەی (دە) ژمارە، كە لە (یەك)ەوە دەست پێ ئەكات هەتا (دە) لەگەڵ (سەر)و (بۆر)و (ژێر)و (زەنە)دا. (مەلا كاكە حەمە)، (38) پیتیی بۆ فێربوونی (ئەلف و بێی زمانی كوردی) داناوە، كە لەمانە (28) پیتیان لە زمانی كوردیو عەرەبیدا وەك یەكن. (10) پیتیشیان تایبەتین بۆ زمانی كوردی. (ئەلف و بێ)یەكە لەڕاستەوە بۆ چەپ ئەنوسرێ ئەویش پیتە بزوێنەرەكانی (ە)و (و)و (ی)ی خۆی بەو ئەهێنێ، لە جیاتی (سەرو (بۆر)و (ژێر)ی عەرەبی.

* * * *

ئەمانەو هەروەك لەیادنامەیەكی تری خۆیدا دەرئەكەوێ چونكە نوسراوێكی تریشی بەكوردی داناوە، وەك: (ئەلفبای فەرەنسز) (لغتی فەرەنسزی)، (نصیحتی زمانی كوردی)، (تأریخی كوردی)، (ریاضتي بدنيه، وازی، یاری)، گۆرانی) (فيزياء)، (مبادئی طبيعت)، (تأريخی طبيعي)، (جغرافی عيراق)، كە ئەمانیشی بەوانا (درس) بەشاگردەكانی خۆی گرتۆتەوە، بەم پێیە نوسراوەكانی (مەلا كاكە حەمە) خۆی ئەدەن لە لە(44)نوسراو.

* * * *

ئەمانە بەشی زۆریان كە بریتییە لە30سی نوسراو، لای كوڕەكانی (مەلا جەلالی كوڕی مەلا كاكە حەمە) پارێزراون[3]. وەك خۆی ئەڵێ: (بێجگە لەوانە نوسراوانی تریش هەن). بەڵام هەتا ئێستا بۆ ئێمە دەرنەكەوتون.

### خوێندنگایەكی تاقانە

هەروەكو لەوە پێش گوتمان؛ سنوری خەبات كردنی (مەلا كاكە حەمە) هەر لەنزیك (باقووبە) وە ئەكشا بەناو كوردستانی عیراق و ئێراندا تا ئەگەیشتە نزیك شاری (سەقز). ئەمانە ناوی چەند گوندێكن لەو گوندانەی كە (مەلا كاكە حەمە) خوێندنگا تاقانەكانی خۆی تیا كردوونەتەوەو لەناویشیاندا منالانی كوردی فێری خوێندەواریو ڕەوشت و خوی بڵند كردووە:

(كریچنە، فقی مستەفا، مەلا هۆمەر، كۆبیك، مەسۆیی، خان ابراهیم خانچی، دار بەڕوو، قەرەداغ، قزرابات، چەوری، دوڕاجی، نەپەسی، غەرە، سیامنصور، چیا ڕەزا، باقووبەرە).

لەیادنامەیەكیا كە لەناو نوسراوەكانیا دۆزیمەوەو بریتی بوو لەچوار لاپەڕە، (مەلا كاكە حەمە)، لەبابەت خوێندنگایەكیەوە كە لەناو هۆزی (داوودە)دا لەساڵی (1940)دا كردویێتییەوە بەم جۆرە هەستو بیرو باوەڕی خۆی دەربڕیوە:.

(لە (940/8/1)ەوە تا (1944/11/1) یعنی چوار ساڵو سێ مانگ لە (داوودە) دەرسەكانی خوارەوەم بە (24) قوتابی گوت، كە كوڕی ئاغاو مسكێن بوون، لەهی ئەم ئاوایییانە: (دوڕاجی، چەوری، غەرە، قەڵا، پەلكانە، قوڕی چای، زنانە، قەلخانلو، هۆمەر صوفی، ئاوایی لفتی ئاغا). بە خۆڕایی دەرسم ئەگوتەوە. خدمتم ئەكرد. چونكە هیچ قەومێكی نەزان بە هیچ نابێ، نە بۆ دین، نە بۆ دنیا. غایەم ئەوەبوو كە ئەمانە لەزانینی دینی مەدەنی بەقەد تاقەت و توانا شتێ وەرگرنو ئەو سایە ڕۆح خەریكی مكافحەی نەزانی قەومەكە بن. ببنە بناغە بۆئەوەی تاقمێكی گەورە ببنە

[3] : خوا لێخۆشبوو (مەلا جەلال كوڕی مەلا كاكە حەمە) سێ كوڕی هەیە: كاك نەوزادو كاك بەختیارو كاك شاسوار.



زانیار. تا بەزانینەوە، سەنعەت و زراعە --- کاسبی، ژیانێکی بشرییان دەس کەوێ.

ئینجا (مەلا کاکەو حەمە) لە پێ ڕەوی خوێندنگا ئەفلاتونی‌یەکەی خۆی ئەدوێ. ئەڵێ: (منهجی درس وابوو"

1.هیچ وە ختێ تێکەڵی غیری خۆیان نەبن.

2.خەو، خواردن، استراحەت، پاکی، عبادت، درس، دائماً لەژێر مراقبەیەکی فنیا بێ.

3.بەش کردنی شەوو ڕۆژیان بە سێ بەشی وەك یەك بێ یەکەم بۆ خەو. دووەم بۆ خوێندن. سێیەم بۆ ڕەحەتی و عبادەت و خواردن و وازی و یاری.

4.غایەیان تەنها دەس کەوتنی زانین بێ، کەبتوانن مکافحەی نەزانی قوم بکەن و هیچی‌تر.

5.شەوو ڕۆژ پێنج نوێژە فەڕزەکە بەجماعت بکەن. کە بەنۆبە بانگ بدەن. امامتی بکەن.

6.لەڕەحەتیا حوڕبن. نەوعە ڕابواردنێکی وا خۆشیان ببێ کە فکری هیچی تر نەکەنەوە.

7.لە زراعەتدا، لە شتی تریشدا، بەقەد توانا ئەوی ئەیخوێنن بیشیکەن.

8.هەموو ڕۆژێ بەقەد توانا ریازەی بەدەنیەیان ببێ.

9.لباسیان هەموو یەك نەوع بێ.

10.لایان وابێ و وابن کە لە یەك باوك و دایکن.

11.بە نۆبە دائماً خوتبەی مەعقول بخوێنن بە سەربەستی.

12.هەموو ڕۆژێ امتحانیان ببێ.

13.وەخت و مقدارو نەوعی خواردن و خواردنەوەو خەویان مەعلوم بێ.

14.هەموو وەختێ مقدارێ پێش بەیانی لە خەو هەڵسن.

15.لە شەویشدا دەرسیان ببێ.

16.زۆر بەدقت لەتۆزو پیسی خۆیان بپارێزن).

*   *   *   *

ئینجا (مەلا کاکە حەمە) ئەڵێ:

(بەم نەوعە(51) مانگ سەعی کرا. بەقەد توانا خەریکی سەرکەوتن و پێگەیشتن بوون).

### شاگردەکان ئەم وانایانەیان ئەخوێند

پاشان (مەلا کاکە حەمە) ناوی ئەو وانایانە ئەنووسێ کە لەو خوێندنگایەدا بەشاگردەکانی خۆی گوتۆتەوە. بەم جۆرەیە کە لە خوارەوە نووسراون:

1.ئەلفبا هەموو نەوعەکانی.

2.نووسین؛ کوردی، عەرەبی، تورکی، فارسی، فەڕەنسزی.

3.حساب بەکوردی.

4.قران.

5.جغرافیای عیراق بەکوردی.

6.جغرافیای عمومی بەکوردی.

7.جغرافیای عمومی بەعەرەبی.

8.تأریخی عمومی بەکوردی.

9.تأریخی کورد بەکوردی.

10.تأریخی اسلام بە تورکی.

11.تأریخی عەرەب بەعەرەبی.

12.مبادئی طبیعت بەکوردی.

13.تأریخی طبیعی بەکوردی.

14.هندسە بەکوردی.

15.اشیاء بەکوردی.

16.اشیاء بەعەرەبی.

17.علمی کیمیاء بەکوردی.

18.علمی فیزیاء بەکوردی.

19.علمی صحە بەکوردی.

20.قانونی عقوباتی بغدادی بەکوردی.

21.قانونی اصولی محاکمات بەکوردی.

22.معلوماتی مدنیە بەکوردی.

23.علمی اخلاق بەکوردی.

24.ئەلفبای فەڕەنسزی بەکوردی.

25.البفای خصوصی تازەی خۆمان (هی کوردی).

26.علمی هیئت و نجوم بەکوردی.

27.نشید (گۆرانی) بەکوردی.

28.ریاضتی بدنیە، وازی، یاری بەکوردی.

29.علمی دین (شرع) بەکوردی.

30.باسی طلاق و نکاح بەکوردی.

31.نحوی عەرەبی بەکوردی.

32.صرفی عەرەبی بەکوردی.

33.قواعدی کوردی بەکوردی.

34.لغتی کوردی بەکوردی.

35.لغتی عەرەبی بەکوردی.

36.علمی فرائض، بەش کردنیماڵەمردوو، بەکوردی،

37.علمی منطق بەکوردی.

38.علمی عقائد بەکوردی.

39.علمی مباحثە بەکوردی.

40.علمی بیان‌و استعارە بەکوردی.

41.علمی منطق بەکوردی.

42.نصیحتی زمانی کوردی بەکوردی.

43.تفسیری قران بەکوردی.

**نموونەیەك لەئەلفباكەی (مەلا کاکە حەمە)**

پاش ئەوە (مەلا کاکە حەمە) (بۆ نموونە چەند دێڕێکی بە (ئەلفبا) کەی خۆی نووسیوە، بۆ مەشق، کە بە شاگردەکانی خۆی بکات. ئەمە چەند دێڕێکێتی:

(ئەی بۆ ڕەحمێ نە کەین
بە دەشتە کی یەکان کە
سەد نەوە دی قەومە کە ما نن

هەر سی‌و هەشت پیتەکەی (ئەلف‌و بێ)یەکەی (مەلا کاکە حەمە)یش ئاوەهایە:

بەپێی ئەم جۆرە (ئەلف‌و بێ)یە، ناوی خۆی وەها نووسیوە:

**کۆچی دوایی**

(مەلا کاکە حەمە)، ئەو ئەستێرە گەشەی کە نزیکەی شەش ساڵی خشت لە بەشێکی گەورەی خاکی کوردستاندا پرشنگی زانست‌و هونەرو خواناسی‌و نیشتمان پەروەری بڵاوکردەوە، لە بەر نەخۆشی لە گوندی (باقوبەرە) وە کە لەلادێی (هۆر شێخان)دایە، هێنایانەوە (سلێمانی). لە ڕۆژی 5/10/ دا لە (سلێمانی)، لەتاو ئازاری نەخۆشی‌یەکەی گیانی پاکی بەخاك سپارد. بەمردنەکەی ئەو کسپە لە جەرگی هەموو کوردێکی نیشتمان پەروەرو دڵسۆزەوە هات، بەتایبەتی لە شاگردەکانیەوە کە هەتا ئەمێنن ئەویان لەبیر ناچێتەوە. نە نەبۆی کەوتە شینەوەو، لەوپەڕی ڕێزدا بەرێی کرد بۆ لای خوای خۆی. لە سەر خواستی (مەلا کاکە حەمە)، خۆی هەرچی کەل‌وپەل‌و نووسراوێکی لێ بەجێ مابوو-بێجگە نووسراوە کوردی‌یەکانی- هەمووی بەرەو ڕووی مزگەوتی (باقوبەرە) کرایەوە. تا شاگردەکانی ئەوێی کەڵکیان لێ ببینن.

(مەلا کاکە حەمە) هەتاما، وەك ڕاستی پەرس خواناس‌و زاناو نیشتمان پەروەرێك ژیا. دڵ‌و زمان‌و دەستی یەك بوو، بەشێوەی ژیانی‌و بەنوسراوە نایابەکانی‌و، ئەفلاتوونی بەکانی، سەری نەتەوەکەمانی بڵند کردەوە.

ئێستا زۆربەی نووسراوەکانی کە بریتین لە سی نوسراو، چوونەتە گەنجینەی وێژەو زانست‌و هونەری کوردی‌یەوە. لەخانوەکەی خوالێخۆشبوو (مەلا جەلال)ی کوڕیا پارێزراوە، لای خێزانەکەی[4]، جا هیوادارم کە خوا ئەو ڕۆژەمان پیشان بدات، کە ئەو نوسراوانە لەلایەن کاربەدەستانی کوردستانەوە، بە چاپ کراوی ببینین. هەروەها پەیکەرێکیشی بۆ دروست بکرێ‌و دابمەزرێنرێ، لە گەڕەکی (دەرگەزێن)دا.

خۆشی لە گیانی پاکی (مەلا کاکە حەمە)، کەوا بەسەربەرزی‌و ڕوو سووری‌یەوە گەلەکەی خۆی بەجێهێشت‌و، چوو بۆ لای خوای خۆی.

هەروەها خۆشی لەنەتەوەی (کورد)یش کە پیاوی وا گەورەی تیا هەڵکەوتووە، کە سەری بڵند کردۆتەوە.[5]

**سەرچاوە:**

**نامیلکەی (مەلا کاکە حەمە)، نوسینی شاکر فەتاح، لەڕیزە نووسراوانی نیشتمانپەروەران. ژمارە(6) چاپخانەی کامەرانی سلێمانی ساڵی** 1972.



[4](مەلا جەلال) کە چووەوە لای خوای خۆی، ژنەکەی‌و کچێك‌و سێ کوڕی هەبوو. ناوی کوڕەکانیان لەمەوپێش نوسیوە. کچەکەیشی ناوی (بێ گەرد).

[5]بەشی زۆری ئەم نووسراوەم لە 1970/11/16دا بەناوی (یەکێتی‌ی نووسەرانی کورد)ەوە، (لقی سلێمانی) لە سەر (تەلەفیزیۆنی کەرکوك) خوێندەوە.

# ئافرەتی کورد

ئـافرەتی کـورد، بەشـی گرنـگ و زۆری نەتـەوەی کـوردە، بـەڵکو نمونەی هەموو (کورد) و (کوردستان)ە. کە ئەڵێن (ئافرەتی کورد). من کورد و کوردستانم بیر ئەکەوێتەوە. هەر چەند جوانی ئافرەتی کورد ئەبینم، چاو ئەندازە جوانەکانی کوردستانم بیر ئەکەوێتەوە. کە کارگوزاری و دڵسۆزی و روخۆشی و فەربەخشی ئافرەتی کورد پیشان ئەدرێ، مـن کزەبا فێنـک و ئـاوە سـازگارەکەی کوردسـتان و میوەهات و سەوزەوات و دانەوێڵەو دارستان و باخات و کانەکانیم بیر ئەکەوێتەوە.

هەر چەند کردەوەی بڵندو پەسەندو بە هێزی ئافرەتی کـوردم چاو پێ ئەکەوێ، شاخ و کێوە بڵندەکان و دەشت و بانە فراوانەکان و کانی و ڕوبارە بەهێزو تیژڕەوەکانی کوردستانم دێتەوە بیر.

هەر چەند کاوڵی و سەرگەردانی ئافرەتی کوردیش ئەبینم، کزی و کەساسـی و چارە ڕەشـی و دواکــەوتنی نەتـەوەی کـورد و وێرانـی کوردستانم دێتەوە یاد!.

جا لە لایەکەوە ئەو هەموو چالاکی یە ئافرەتی کورد هەیەتی، لە لایەکی تریشەوە ئەو هەموو زورو ستەمەی کە خێزان و کۆمەڵ لێی ئەکات.. ئەوانە هەموی خستیانمە سەر ئەوەی ئەم (نوسراو)ە لـە سـەر (ئـافرەتی کـورد) بنوسمــەوەو پێشکەشـی خوێندەوارانـی بەڕێزی بکەم.

مەبــەس لـــەم نوســـراوە تـــەنیا زانیـــاری نیـــە. هـــەروەها هوشیارکردنەوەو تێکۆشینیشە. ئەمەوێ بیرو هۆشی نەژادی کورد بـبزوێنم: تـا لـە ئـافرەتی کـورد بکۆڵنـەوە، بـیر بکەنـەوە، هـۆی دواکـەوتن و چـارەی پێشکەوتنیشـیان بدۆزنـەوە. ئینجـا دەمـاری مەردایەتی و نیشتمان پەروەریشیان ببزوێ بۆ پێش خستنیان لە کۆڕی کۆمەڵایەتی و فەرمان ڕەوایی (حکومەت=سیاسەت) و ئابوری و خوێندەواریدا.

جا ئەگەر لە نوسراوەکەما کەم و کوڕی یەك هەبێ، لە بەرئەوەیە کە هیچ بناوان و سەرچاوەیەکم دەست نەکەوتوە کەڵکی لێ وەرگرم.



بەرهەڵسـتی کۆمەڵایەتیشــمان ڕێی نــەداوم بــاش تێکــەڵی ئافرەتانی کورد بکەم تا لە هەموو ڕویەکەوە تێ یـان بگـەم. ئـەوی نوسیومە تەنیا سەرنجدان و لێکۆڵینەوەی خۆمە. دور نیە لـە هـەندێ لاوە ناتەواو دەرچێ. لەوەدا داوای بەخشین ئەکەم.

چیرۆکەکان هەموو ڕاستەقینەن. زۆریان بە چاوی خۆم دیومن. بەڵام (بەهەشتی دڵداری)، (سەیران)، (تاسەی نیگایەك)، (من و تۆ)، و (گۆرانی نیوەڕۆ) کە هەڵبەسـتن: تاسـەو هەسـتی لاوانـی کـوردو ئاواتیـان پیشـان ئـەدەن لـە کـۆڕی دڵداریـی و ژیـانی خـێزانیدا. وتارەکانی تریش ژینی ئافرەتی کوردەواری و پێشنیار (اقتراح)ەکانم پیشان ئەدەن بۆ پێشخستنیان.

بە هەموو ڕەنگ ئەوەندەی لە توانام دا بو، تێکۆشام بۆ ئەمـەی وێنەیەکی تەواو و ڕاستەقینەی ئافرەتی کورد پیشان بدەم بە ئازارو ئاواتیانەوە.

جا ئەگەر نوسراوەکەم بەئامانجی خۆی بگات و (ئافرەتی کورد) کەڵکی لێ وەرگرێ ئەوا خۆم بەشادمان ئەزانم.

دیسانەوە ئەیڵێمەوە:

(ئافرەتی کورد) نیشانەی (نەتەوەی کورد) و (کوردستان)ە چەند ئافرەتـە بـەڕێزەکانمان پێـش بخـەین، هێنـدە کـورد و کوردسـتان پێش ئەکەون.

دەسا نـۆرەی کۆشـش و هونـەرە بـراو خوشـکە بـەڕێزەکان. بـام دەس لەدەس بێ و هێز لەخوا.

## جوانی ئافرەتی کورد

تێکڕا، کچە کوردەکان جوانن، لە لەش و لاردا: ڕێك و پێك، لەقەد و باڵادا پەسەند، لە ڕەنگدا: سورو سپی یاخود گەنم ڕەنگ، لەچاوا: گەش و ڕەش، یاخود گەش و مەریی، لەقژا: ڕەش، لە ڕوودا: خۆش و ئێسك سوك و شێوە شیرین. جارو بارێکیش ڕەنگ سورو سپی یەکی چاوشین یاخود کاڵ، یان پیرۆزەیی و قژ زێرینێکی وا ئەبینی لای وایە کە لە بەرامبەر هەرە جوان و نازەنین ئافرەتی ڕۆژئاوادا وەستاویت. کورد دڵی بەئافرەتی قەڵەودا ناچێ. شاخ و داخی کوردستان و کارو فرمانی زۆریش ڕێی ئافرەت نادەن قەڵەوبن. لەگەڵ ئەوەشا بەزۆری تەنکەو شوشەیی و بەهێزو تەن دروستن. لەبەر ئەوە لە کوردستاندا ئافرەتی قەڵەو کەم ئەبینی، مەگەر لە ماڵە گەورەو دەوڵەمەندەکاندا کە فرمانیان زۆر کەمە، جووڵەیان زۆر کەمە، بەزۆری وەختیان بە خواردن و دانیشتن و خۆ ئاڕایشت دانەوە بەخت ئەکەن!..

جوانی ئافرەتی کورد جوانی یەکی خوایی یە، سادەیی و تەندروستی و چست و چالاکی تیایە. نەسوراوو سپیاو ئەکەن. نە خاڵ و نەخش و نیگار ئەڕێژن. نە بەزۆریش خۆیان جوان ئەکەن!.. لە ڕاستیا جوانی ئافرەتی کورد لەوەوە هاتۆتە بون کە لەشێوەی کارو فرمان و ژیانیاندا، گەلێك وەرزش و ڕەوشتی تەندروستانەو دەرونی مەردانە هەیە. بە سەر شاخا هەڵ ئەگەڕێن. سواری وڵاخ ئەبن و ئەگەڕێن. لەناو مێرگو چیمەن و باخ و دارستان و بێستاندا



فرمان ئەکەن و گەشت وگوزار ئەکەن. بای فێنك و پاك هەڵئەمژن. تیشکی ڕۆژ لێیان ئەدا. بە ئاوی سارد خۆیان ئەشۆن. خواردەمەنی تەندروستانەی وەك میوەهات و سەوزەوات و شیرو پەنیرو فرۆو ماست و هێلکەو سیرێژو هەنگوین و کەرەو دۆ بە نانەوە ئەخۆن. بەدڵێکی بێ گەرد و دەرونێکی خاوێنیشەوە ئەنون. بەرەبەیانیش زوو لەخەو ڕائەپەڕن و ڕو لە خوا ئەکەن. پاشان دەست بە کارو فرمانی خۆیان ئەکەن.. بۆیەکا وا دڵکێش ئەکەن.

بەڵام لەمەوە وا تێ نەگەیت کە ئافرەتی کورد لەخۆ جوان کردنا کەمتەرخەمی ئەکات. ئەمیش گەلێك بە تەنگ بەرگو پۆشەنی ڕەنگاو ڕەنگ و چەك و خشڵی پەسەندو بونی خۆش و خۆ ڕێکخستنەوەیە. بەڵام تەنانەت لەوەشا حەز لەسادەیی و سەر ڕاستی ئەکات. لەفرۆفیلوو چاوڕاوی خۆ جوان کردن ڕقی ئەبێتەوە.

بەڵام داخەکەم ئەم جوانی یە خوایی یە تا سەر بۆ ئافرەتی کورد نامێنێتەوە هەر ئەوەندە چەند ساڵێك بە سەر شوکردنی کچە کورددا تێپەڕی، لە تاو ئەرك و ئازاری ژیانی خێزانی و زۆرداری کۆمەڵ و گەلێك وەختیش هەژاری، جوانی یەکەی بار ئەکاو شەنگ و شۆخی یەکەشی لە ناو ئەچێ!..

ئەمەی لە سەرەوە گوتمان دەربارەی ئەو ئافرەتانەیە کە نە هەژارن نە دەوڵەمەندن. چونکە دەوڵەمەندەکان لە بەر نەپاراستنی تەندروستی خۆیان لە خواردن و جوڵان و کارو فرماندا نەخۆشی سەریان تێ ئەکات، جوانی یەکەیان لێ تێك ئەدات. هەژارەکانیش لە بەر ڕووتی و کەم خۆری و خەمو خەفەتی نەبونی و کزی و بێ دەسەڵاتی خۆیان هەمیسان دوچاری خوێن کەمی و نەخۆشی ئەبن و جوانی یەکەیان دەرناکەوێ!.. کەی ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتیمان ڕاست کرانەوە ئەو جوانیانە دەرئەکەون، بەڵام جێی داخە کە ئێستا ئەو هەژارانەمان یەجگار زۆرن!؟..

## بەرگ و پۆشەنی

لە جوانی و ڕەنگاوڕەنگی و ڕێك وپێکی و شەنگ و شۆخیدا، بڕوا ناکەم، هیچ بەرگ و پۆشەنی یەك بگاتە بەرگ و پۆشەنی ئافرەتی کورد. جوانی ی ئافرەتی کورد بە جارێ بەرجەستە ئەکات. جگە لەوە بەجۆرێکی وای ئەڕازێنێتەوە، نەك بە تەنیا دڵی پیاو کێش ئەکا، سام و خانمانی یەکی وەهاشی پێ ئەبەخشی، پیاو ناچار ئەکات کڕنۆشی خۆشەویستی و نەوازشی بۆ بکێشێ!.. لە بەر ئەوە بەرگ و پۆشەنی ئافرەتی کورد بابەتی ئاهەنگ و جەژنانە. چونکە پڕشنگی جوانی و داوێن پاکی و دڵتەڕیی ئەداتە دڵی دانیشتوان. بەڵام داخەکەم ئەم بەرگ و پۆشەنیانە لە دەست هەموو کەس نایەن. تەنیا دەوڵەمەندەکان ئەتوانن پەیدایان کەن. چونکە هەموو بابەتی سورمەو ئاوریشمن. چەکەکانیش بابەتی زێڕو یاقوت و پیرۆزەو یاقیق و شیلانن.

جگە لەوە هەم لەژمارەدا زۆرن، هەم لە کێشانەدا گرانن، هەم لە نرخیشا لە وزەی چینی ناونجیو هەژار بەدەرن. لە بەر ئەوە بە ناچاری هەژارەکان، تەنانەت چینە ناونجییەکانیش، وازیان لەزۆر پارچەی بەرگو پۆشەنیو چەك هێناوە. جگە لەوە وازیان لەشتی نرخ گرانیش هێناوە. بەڵام لە تۆڵەی ئەوەدا بەشی زۆری جوانی خوا کردو تەندروستییان بۆ خۆیان داگیرکردوە. چونکە بەرگو پۆشەنیو چەکی ئافرەتە دەوڵەمەندەکان وەك هی هەژارەکان ماوەی سرەوتی لەشو مژینی بای پاكو وەرگرتنی تیشکی ڕۆژو سەرسوکیو سەربەستی نادەن. لەبەر ئەوە جیاوازییەکی زۆر ئەبینین لەمیانی بەرگو پۆشەنیو چەکی هەژارو دەوڵەمەندا. هی دەوڵەمەند پشتی دەرامەدی خێزان ئەشکێنن. هی هەژار بە کەڵکی گوزەرانی خێزانی دین. هی دەوڵەمەند تەندروستانە نیە. هی هەژار تەندروستانەیە. سەیر کەن بەرگو پۆشەنیو چەکەکانی ئافرەتە دەوڵەمەندەکانتان بۆ بژمێرم: (دو ژێر کراس. کراس. ئاوەڵ کراس. گۆرەوی. ڕووپۆش (پەچە). باڵاپۆش (عەبا). پاوانە. خرخاڵ. بازنو گۆ. ئەموستیلە. قەتارە. لاگیرە. حیّلومیخەك. کەمەرەو لولە. پشتەسەر، هەیاسە. سەر پەرچەم. گەردانە).

بەڵام ئەم چینە بەچینی ناوەڕاستیشەوە هەر پێنج یەکی ئافرەتی کورد ئەگرێتەوە. ئەو چوار بەشەکەی تری هەژارن. ئەمەش بەرگو پۆشەنیانە: (کراس. ئاوەڵ کراس. کلاو. کۆڵوانە. پشتێن. پێڵاو (کەوش یان پانیبەرز). تێکڕا ڕەنگی ئەم کەلوپەلانە ڕەش، یان خومییە. بەڵام ئەم بەرگانە لە هەندێ لادا یەجگار فراوانن. گەلێك دەست بلاوی تیا ئەکرێ، هی ئافرەتێکی کورد بەشی بەرگو پۆشەنی سێ چوار ئافرەتی ڕۆژاوایی ئەکات.

پێویستە پێی لێبنێین کە ئەم بەرگو پۆشەنیو چەکانە لە هەموو شوێنێکی کوردستاندا وەك یەك نین. کەمەکێ لە یەکتر لەشێوەو لە ڕەنگو لەقایمیو تەنکیدا جیاوازییان هەیە. وەك جیاوازی کراسی ژنە بلباسیو ژنە بادینانی. یاخود وەك جیاوازی سەرپێچی ژنە جافو ژنە یەزیدی. بەڵام ژیانو فرمانی ئیمڕۆی ئافرەتی کورد پێویستی بە گۆڕینی بەرگو پۆشەنیو چەکەکانی هەیە. پێویستی بە بەرگێك هەیە لەمانە هەرزانترو سوکترو گورجو گۆڵترو تەندروستانەتربێ. بۆ ئەوەی ئازایانەو سەربەستانە بە لەشێکی سوکەوە فرمانەکانی زۆرتر بکا، زووتر ڕایان پەڕێنێ. تا بڕشتیان باشتربێ بۆ خۆیو خێزانەکەی. پێویستە بە جارێ واز لە چەکەکانی بهێنێ. لە بریتی ئەوە پێویستی خۆیو خێزانو ناومالی پێبکرێ. لام وایە بەرگو پۆشەنییەکانی ڕۆژئاوایی بۆ مەبەستی پێشکەوتن لە مانەی خۆمان چاکترن. یاخود بە ئاخافتنێکی تر ئەگەر بەرگو پۆشەنییەکانی ئافرەتی کورد بژارکرێنو ڕاست کرێنەوە بەرگو پۆشەنییەکی بەکەڵکی هەرزانی پاكو پوختەو گورجو گۆڵی ئەم چەرخەی لێپەیدا ئەبێ.

جێی دڵخۆشییە کە خوشکە خوێندەوارەکانمان خۆیان داوەتە پۆشینی بەرگی ڕۆژئاوایی، بەرگی خەباتو پێشکەوتنو ئازادیی. وا ئالای ئازادییو پێشکەوتنیشیان هەڵکردوە بۆ خۆ رزگارکردن لە چەكو سەروپێچو روپۆشو بالا پۆشو گەلێك بەرگو پۆشەنی گرانو بەئەركو ئازاری کوردی. لام وایە ڕۆژێك دێت کە خوشکە ئافرەتەکانی تریشمان لە باتی چاو لێکەری ئافرەتی دەوڵەمەند، چاولێکەری خوشکە خوێندەوارەکانیان بکەن لە فڕێدانی چەكو گەلێك بەرگو پۆشەنی بێفەڕا. تا ژیانی خێزانیو گوزەرانی گشتیمان بەرەو ئامانجی بڵندمان پێشکەوێ.

### دڵدارییو ژنو مێردیی

چاو ئەندازە جوانەکانو ئاوو، با، سازگارەکەی کوردستانو شێوەی ژینی ساکارو پاكو سەربەستانەی کوردەواری.. کچە کورد ئەخاتە سەر بیرکردنەوە لە دوا ڕۆژێکی بەختیاریی بە مێردو ماڵو منالەوە. شەیدای ئەکا بە جوانیو مەردایەتیو پیاوەتی ئەو کوڕەوە، کە لە دڵو گیانو کردەوەو ڕەوشتا لەگەڵیا ڕێك ئەکەوێو لە تەکیا یەك ئەکەوێ. ڕوو نە پۆشین (سفور)و سەربەستی لە تێکەڵ بونی پاكو بێگەردی هەردوو ڕەگەزدا، کە لە ڕۆژانی کشتوکاڵو شینایی بەرهەم هێنانو دارکردن لە چیاو مازوو چنینو کاروان کردنو ئاهەنگان دا پێك دێ.. ئەمانە هەمووی کوڕو کچ ئامادە ئەکەن بۆ یەکتر ناسینو دۆستایەتی گرتنو خوازبێنیکردن. زۆری پێناچێ کچە دڵی ئەبەسترێ بەدڵی لاوێکەوە. پاشان لەگەڵیا ئەبێ بە دۆستو دڵداری لەگەڵ ئەکا. ئینجا لاوەکە داوای مارەکردنی کچەکە لە خێزانەکەی خۆی ئەکا. خوازبێنی ئەکرێو مارە ئەکرێ. بەم ڕەنگە لە ناو بەشی گەورەی کوردەواریدا (جگە لە دەوڵەمەندو هێزدارەکان) ژنو مێردی لە سەر بنچینەی دڵدارییەکی دولایی سەربەستانە پێك دێت. بۆیەکا، تێکڕا، بەشی زۆربەی خێزانەکانی کوردەواری، بە مەندیو پەسەندیو بێدەنگییەوە ژینێکی ناو ماڵی بەختیارانە بەسەر ئەبەن. لەگەڵ یەکا، ژنو مێرد، خۆشەویستو یەکدڵ، بەڕویەکی گەشو کۆششێکی مەردانەی جوت لاییشەوە بۆ ژینێکی خۆشی پڕ کامەرانی تەکان ئەدەن.

زۆرتر، ژن هێنان، لەناوەند خزمو کەسو کاردا باوە. ئەمیش لەبەر ئەوەیە خزمایەتیو هۆزایەتی بپارێزرێ. جگە لەوە ئەگەر یەکێ لەژنو مێرد مرد لە پاش بەجێ ماوەکەی (ارث) دەست بێگانەیەك نەکەوێ! نەوەك لە پاشدا گەڕو گێچەڵی لێپەیدابێ!..

کورد زوو ژن ئەهێنن. زۆری وا هەیە لە چواردە ساڵیو پانزە ساڵییەوە ژن ئەهێننو شو ئەکەن. ئەمەش بەربەستێکی بەهێزە بۆ داوین پیسی. بەڵام ئەم جۆرە ژنو مێردییە لە ناو چینی دەوڵەمەندەکانو خوێندەوارەکاندا پێك نایەت. لە بەر ئەوە کارەساتی داوێن پیسی جاروبار لە ناو شارەکاندا روو ئەدات. هەر چەندە خۆم لەو باوەڕەدام کە ژنو مێردی لە تەمەنی بیستو پێنج

سالێدا پێك بێت چاكترە، چونكە هەردولا خوێندنی خۆیان تەواو ئەكەن و لەژیان و جیهانیش شارەزا ئەبن. بەلام داخەكە بۆ ئەم وەختەو لە ناو ئەم جۆرە كۆمەڵە زۆردارەدا ناچارم دان بەوەدا بنێم كە (زوو ژن هێنان) وەك هەی لادێیی و هەژارەكان چاكترە بۆ پاراستنی داوێن پاكی و بەر بەستكردنی كارەسات و كەتنی ناپەسەند[5].

ژن هێنانی چینی هەژاران كەمی تێئەچێت. بەلام ژن هێنانی چینی دەولەمەندو دەسەلاتدارەكان یەجگار زۆری تێئەچێت!. چونكە ئەم چینە كەم بە تەنگ دلداری پاك و بلندەوە ئەبێ. زۆرتر خەمی سایەو مایەو پایە ئەخوات لە ژن خوازیدا!..



لەبەر ئەوە سروشت تۆڵەیان لێئەكاتەوە. كاتێك ئەزانێت شیرازەی ژن و مێردی لە ناویاندا پچڕا. ئاژاوەو ناخۆشی و ناكۆكی و دوژمنایەتی كەوتە ناو ژن و مێردو كەس وكاری هەر دولاوە. ئەنجامەكەشی یان بەخوێن ڕشتن یان بەسەرگەردانی و مال وێرانی گەیشت!.. جاروبار مێردەكە، ژنەكەی كەنەفت ئەكات. ژنێكی تر دێنێ پاش ئەوە لە میش بێزار ئەبێ. ژنێكی تریش دێنێ. ئینجا ژنی چوارەمیش مارە ئەكات!.. ئەنجام؟.. ئەنجام ئەوەیە ئەو ژنە كلۆلانە ئەكەونە بەربەرەكانێ و دوژمنایەتی. ژین لە خۆیان و منالیان و مێردیان بار ئەكەن. ئاگری شەڕ بلێسە ئەسێنێ. ناو گوندو ناو هۆزو تیرەیش ئەگرێتەوە!.. برا لە براو خۆشك لەخوشك ئەبن بەدوژمنی خوێنخۆر. هەتا سەر ناخۆشی و سەرگەردانی یان نابڕێتەوە!..

بەلێ ئەو نازی (دلداریی) نەكێشێ تووشی سزای سروشت ئەبێ. (دلداریی) شتێكە خوای پیرۆزو بەرزو بەفەر دەسەلاتێكی هەیە بەرەنگاری ناكرێ. فەرمانێكی هەیە ئەبێ جێبەجێ كرێ. بەلام بە سایەی خواوە زۆربەی نەتەوەی كورد ئەم دەستوری (دلداری)یە ناز ئەكێشێ. لەبەر ئەوە بەشی زۆری خێزانەكانی بەهێزو هۆگری یەكن. سا هەر لەبەر ئەوەیە كە ئەم هەموو كارەساتە گەورانەی ڕۆژگارە نەیانتوانیوە نەتەوەی كورد لەناو بەرن!.

**فڕاندن. هەلاتن. ڕەدوكەوتن**

جا خاك بەسەر ئەو خێزانانەی دلی دلداران ئەشكێنن و پەكی پێك هێنانی ژن و مێردییان ئەخەن!.. هاكا ئەزانێت كوڕو كچ لە باوك و دایكیان هەل ئەگەڕێنەوە، پێوەندی زۆرداریان ئەپچڕێنن و ئەچنەوە سەر ڕێگای خوایی كە ئەبێ هەمو ژن و مێردی یەك لەسەر بنچینەی دلداری كوڕو كچ دامەزرێ. هەلدێن بۆ شوێنێكی نهێنی. لەوێ لە پەنای پیاوێكی دەسەلات داراو لە سەردەستی خوا ناسێكا ئەبن بەژن و مێردی یەكتری و مارەكردنەكەیان ئاشكرا ئەكەن.

[5] بەو مەرجەی نەهێلن منالیان بێ، تا لە خوێندن ئەبنەوەو دەرامەدێكی باش بۆ خۆیان پەیدا ئەكەن.

ئەوساش یان بەبێ دەنگی، یان لە پاش شەڕو شۆڕێکی زۆر لەمیانی خێزانی هەردوولادا، کەینو بەینەکەیان ئەبڕێتەوە، کچ فڕاندن، کچ هەڵاتن، کچ ڕەدوکەوتن، کە لە پاش دڵداری‌یەکی پاکو بێگەرد لەمیانی کچو کوڕا پێك هاتبێ، لە ڕاستیا شۆڕشێکە بەرامبەر ئەو باوكو دایکە ناشی‌یانە کە بەپێچەوانەی ڕێگای سروشتو ئاینی خوایی ئەجوڵێنەوە. ئەگەر سەر ڕاست بوینایە، ئەبو ئەم جۆرە هەڵاتنە، کە دووربێ لە کەتنو داوێن پیسی‌و بەژنو مێردی‌یەکی خوا ناسانە دوایی بێت، بە کارەساتێکی پەسەندمان بزانیایە. ئەبو سزای ئەوانەمان بدایە کە بون بەهۆی ئەم هەڵاتنە، نەك سزای هەڵاتوەکان بدەین!.. تاوانکەر لێرەدا گەورەی خێزانە، کە بۆ کەڵكو خۆپەرستی خۆی، کچ بە کچ ئەگۆڕێتەوە، کچ بە پارە ئەفرۆشێ، کچ بە سایەو پایە ئەدا. تاوانکەر گەورەی کچەکەیە کە هیچ باکی بە داشکاندنی کچەکەی خۆی‌و دەزگیرانەکەی نیە. ئەوە دەستوری خوایی‌و سروشتی ئەشکێنێ، دەستوری (دڵداریی). کەواتە پێویستە سزای خاوەن کچ بدرێ کە بوە بەهۆی ئەو هەڵاتنە. پێویستە (یاسا=قانون) یەك دەرهێنرێ بەربەستی ئەم زۆرداری‌یە بکات لە خاوەن کچ. نرخی ژن هێنانی یەکجار هەرزان کات. نەیەڵێ خاوەن کچو کوڕ دەست خەنە مارەکردنی کوڕو کچەوە. فەرمان دات تەنیا لە سەر دەستی (ناو باژێکەر=قاضی)دا نەبێ مارە نەکرێن. لەگەڵ نەهێشتنی هەژاریدا ئەگەر ئەمانەکران: هەڵاتن، فڕاندن، ڕەدوکەوتن ڕوو نادەن، نە لەچینی دەوڵەمەندا، نە لەچینی هەژارا، نە لە هۆزو گوندا، نە لەباژێڕو شارا. هەروەها داوێن پیسیش ڕونادات.

ئەم قسانەی کردمان هەر بۆ کچ نین. بۆ ئەو ژنانەش کە ڕەدو ئەکەون. چونکە ئەوانیش لە بنچینەدا بە زۆر دراون بەشو، بەنابەدڵی. ئەگەر لە مێردیان بێزار نەبونایە ڕەدوو نە ئەکەوتن!..

**داوێن پیسی**

کەم ڕو ئەدات پیاو، کچ یان ژن بەنابەدڵی خۆیان بفڕێنن ئەگەر ئەوەی کرد کەس‌وکاری کچو ژن بۆ سڕینەوەی ئابڕووی خۆیان ئەیکوژن. لەوەدا نەتەوەش یارمەتی‌یان ئەدا. هەروەها ئەگەر هەڵاتنی کوڕو کچ، یان ڕەدو کەوتنی ژن بۆ مەبەستی داوێن پیسی بێ، یاخود بێ‌فڕاندنو هەڵاتنو ڕەدوکەوتن داوێن پیسی‌یەك ڕوبدات، کەس‌وکاری کچو ژن پشت ئەستور بە نەتەوە هەردولا ئەکوژن!.. لەبەرئەوە ئەتوانم بڵێم لە کوردستاندا داوێن پیس ناتوانێ بژی. یان ئەکوژرێ یان تەفروتۆنا ئەکرێ. جاران کە داوێن پیسی‌یەك ڕووی ئەدا دانیشتوانی گەڕەك هەموو گەلەکۆمەڵێ‌یان لێ‌ئەکردن، خۆڵو دۆیان ئەکردن بەسەراو بەسواری کەر بە ناو شاردا ئەیان گێڕان، پاشان لە یەکیان مارە ئەکردنو شار بەدەریان ئەکردن!..

لە (1919) بە دواوە لە هەندێ شارەکانماندا لەشکری داگیرکەر (سۆزانی خانەی گشتی=المبغى العام)یان کردەوە. بەڵام نەتەوە ماوەیانی نەدان زۆر بمێننەوە یەکدو ساڵێکی پێ‌نەچو، حکومەتیان ناچار کرد هەڵیان گرێ.

بێ ئەمەی ستایشی نەتەوەی کورد بەزبانی خۆم بکەم، لە زبانی ڕۆژهەڵات ناسەکانەوە ئەیگێڕمەوە کە نەتەوەی کورد لە هەموو ڕۆژهەڵاتدا یەکەم نەتەوەیە کە داوێن پاکی ئافرەتی خۆی پاراستبێ (میجەر سون)و (میستەر ریچ) هەردوکیان ئینگلیزنو لەو ڕۆژهەڵات ناسانەن.

لەگەڵ ئەوەشا پێویستە پێی لێببینین کە کۆمەڵایەتی ئیمڕۆمان ماوەی ڕوودانی داوێن پیسی ئەدات. هۆی ئەمەش شێوەی ژیانمانە کە دامەزراوە لەسەر بنچینەی زۆرداری. جا هەتا ژیانی ئابوری‌و کۆمەڵایەتیمان وەها ڕاست نەکەینەوە کە هەژاری‌و نەخوێندەواری‌و نەخۆشی‌و زۆرداری لەناودا نەمێنێ، هەزار کوشتنو بڕینو شاربەدەری بکەین لە داوێن پیسان، داوێن پیسی هەر ڕوو ئەدات!؟..

**ژینی خێزان**

ژنە کورد، دڵ بە مێردو ماڵو منداڵی خۆی زۆر خۆش ئەکات. بۆیەکا لە خۆشی‌و تەنگانەشا هاوبەشی مێردەکەیەتی. چ لە کارگەو کێڵگەدا، چ لە دارکردنو کڕینو فرۆشتنا لەگەڵ مێردەکەیایە یارمەتی ئەدا. ئەم فرمانانە هەر چەندە بۆ ڕەگەزی ئافرەت گرانن، بەڵام ژنە کورد بەڕوویەکی گەشو دڵێکی خۆشەوە ئەیان بینێ. جگە لەوە فرمانە ماڵی‌یەکانی خۆشی ڕائەپەڕێنێ، وەك: ڕازاندنەوەی ماڵو بەخێوکردنی منداڵو سازکردنی خۆرشتو بەرێکردنی میوانو یاریدەدانی هاوسێ‌یان. گەلێ ئافرەتی کورد هەیە، بەوەش واز ناهێنێ: قاڵی‌و بەڕەو خورجو هەگبە، یاخود ماستو فرۆو دۆو پەنیرو ژاژیكو ڕۆن دروست ئەکات بۆ کەڵکی خێزانو بۆ فرۆشتن. هی واشیان هەیە وەك پیاو بەتفەنگەوە پاسەوانی ماڵو ئاژاڵ ئەکات!..

جا لەبەر ئەم هەمو کردەوە ڕەندینانە، ژنە کورد، مێردەکەی ناچار ئەکات بەدڵ ڕاگرتنو نەوازش کردنی. لە ڕاستیا کەیبانوی کورد مافی هەیە؛ ماڵ بگرێتە ژێر چنگی خۆی، لە هەموو بابەتێکەوە ئازادو سەربەست بێ. وەك مێردەکەشی ماڵ بەڕێوە بەرێ. کەواتە بام خوێندەوارە بەڕێزەکانی کورد، ڕێزی ئافرەتی کورد بگرنو پاداشی چاکەشی بدەنەوە!.

مێرد ژنەکەی بەناوی کوڕە گەورەی یاخود کچە گەورەیەوە بانگ ئەکات. هەروەها ژنەکەش مێردەکەی وا بانگ ئەکات.

ژنو مێردی کورد، هەردوو، حەز لەمنداڵی زۆر ئەکەن. کە گەورەش بن حەز ناکەن لێیان جیابنەوە. حەز ئەکەن ژن بۆ کوڕیان بێننو بەخۆیانو ماڵو منداڵیانەوە هەر لەگەڵیان بمێننەوە. ئەمەش

بۆ ئەوەیە خێزان کۆك و بە هێزو یەك بن، خۆش ڕابوێرن و دەرامەتیش پێکەوە بکەن.

گەورەی خێزان مێردە. بەڵام ژن و منداڵەکانیشی لە هەڵسوڕاندنی کاروباری ماڵ و خێزاندا یاریدەی ئەدەن و ئامۆژگاری و پێشکەش ئەکەن. بەڵام ئەگەر مێرد گەورەیی خۆی بەجێنەهێنا نە ژن، نە منداڵ بە گوێی ناکەن!..

داخەکەم، زۆری خێزان، گەلێك وەخت ئەبێتە هۆی ئاژاوەو شەڕوشۆڕی ناوماڵ، خۆ ئەگەر خەزورو خەسوو دش و هێوەرژن لە ماڵدا بن، ئەوە قەت ناتوانن هەڵ بکەن!.. پێشینان گوتویانە: (نە پێڵاوی تەنگ، نە خانەی بە جەنگ). لە بەر ئەوە ئامۆژگاری کچ و لاوە بەڕێزەکانمان ئەکەم تا ئەتوانن لە خانویەکی سەربەخۆدابن. بەڵێ ڕێزگرتنی دایك و باوك و خەسوو خەزوورو خوشك و براو کەس وکار پێویست. بەڵام پێویست نیە ژن و مێردی نوێ، ژیان و گوزەران و سەربەستی و کامەرانی خۆیان پایەماڵ بکەن تەنیا بۆ ئەمەی لەناو خانویەکدا لەگەڵ ئەو کەس وکارانەدا بژین.

ژن و مێردی ژیر، هەر چەندە لە خانویەکی سەربەخۆشدا بژین، هەمیسان ئەتوانن یارمەتی ئەو کەس وکارانەیان بدەن و ڕێزیان لێبگرن و بەخۆشیشەوە لەگەڵیاندا هەڵ بکەن.

کەم پیاو هەیە کە ژنی مرد. ژنێکی تر نەهێنێ. بەڵام زۆر ژن هەیە کە مێردەکەی مرد شوو ناکاتەوە. بەلەش سوکی و چست وچالاکی و داوێن پاکی خۆیەوە ڕەنج ئەداو کۆشش ئەکا، تا منداڵەکانی لەدەمی باوکیان باشتر بژیێنێ!..

**مامۆستای ئافرەت**

زۆربەی ئافرەتەکانمان: نەخوێندەوارن، نەشارەزان، نازانن لە جیهاندا بەڵکو لە نیشتمانەکەی خۆیاندا چی هەیە. چی ڕو ئەدا؟ بۆچی وا ڕوئەدا؟!.. نازانن بۆچی وا پاشکەوتون؟ یان چی بکەن تا پێشکەون؟!.

لەبەر ئەمە هەمو کزو بێدەسەڵات و بەشخوارو سەرگەردان ماونەتەوە. جا لەبەر ئەوە پێویستە تەنیا بە کردنەوەی خوێندنگا بۆ فێرکردنیان واز نەهێنین. خۆیشمان ببین بە مامۆستایان. خۆیشیان بکەین بە مامۆستای خۆیان.

چ لە ماڵەکانی خۆماندا چ لە دەرەوە، بەم کۆبونەوەی وێژە (ادب)یی و زانستی (علمی)و هونەری جوان (فنونی جمیلە)و کۆمەڵایەتی (اجتماعیات) پێك بهێنین: تا چاویان بکەینەوە، مێشکیان ڕوون بکەینەوە بۆ ئەمەی لە خۆیان و لە جیهانیش تێبگەن. جارێ بەم (تێکەڵی ژن و پیاو) لە ناوەند خزم و کەس وکاردا، ئینجا لە ناوەند دۆستە دڵسۆزەکانماندا، پاش ئەوە لە ناو پیاوو ژنی بێگانەی کردەوەو ڕەوشت باشدا پێك بهێنین. لەم تێکەڵ بونانە ئافرەتەکان: چ لە یەکترییەوە، چ لە پیاوە تێگەیشتوەکانەوە گەلێ شتی پاك و پوختەو باش فێر ئەبن. چاویان ئەکرێتەوە. وریا ئەبنەوە. سەربەست ئەبن. بارستایی تێگەیشتنیان بڵندتر ئەبێتەوە. لە ژیان زۆرتر خۆشی ئەچێژن. چونکە ئەتوانن پارێزگاری مافی خۆیان بکەن.

بەڵام لەمانە هەمووی گرنگتر ئەوەیە شێوەی ژیانی (ئابوری)و (کۆمەڵایەتی)مان بگۆڕین و ڕاست کەینەوە. پێویستە ئافرەتیش وەك پیاو هەموو فرمانێك بکا. تا بتوانن سەربەخۆبن. بەڵام ئەوەی دەستیان ئەکەوێ لەگەڵ دەستکەوتی مێردەکانیاندا بۆ ماڵ و منداڵەکانیان بەخت کەن. پێویستە تا بتوانین فرمانی ناو ماڵی ئافرەتەکانمان کەم کەینەوە، تا هەموو ڕۆژ، وەختێکی باشیان بۆ بمێنێتەوە بۆ چونە دەرەوەو تێکەڵ بون و خوێندەواری و پیشەوەری فێربوون و تێگەیشتن و وریا بونەوە سەربەست بون بە بۆنەی سەربەستییەوە. ئەمەوێ تۆزێك لە ڕوو پۆش (بەچە)و باڵا پۆش (عبا) بدوێم. لە کوردەواریدا روو پۆش و باڵا پۆش قەت نەبون. بەڵام چەند سەد ساڵێك لەمەوپێش (خونکارێکی تورك) ڕوو پۆش و باڵا پۆش بڕیی بەسەر کوردا!. بەڵام فەرمانەکەی زۆر بڕی نەکرد!..

تەنیا لەناو هەندێ لە خێزانە گەورەو دەوڵەمەندو کۆنە پەرستەکاندا مایەوە!.. لەبەشی هەرە گەورەی کوردەواریدا نەمایەوە. (ئاینی پاکی ئیسلامیش) بەربەستی ئافرەت ناکات بێ روو پۆش و باڵاپۆش بسوڕێتەوە!.. ئیتر نازانم بۆ چ ئەمەندە بە تەنگ شەرمی درۆوە بین؟!. رووپۆش و باڵاپۆش ئافرەتی کورد ئەخەنە دیلییەوە. ترسی پێیەیدا ئەکەن لە پیاوو لە ژیان. دووری ئەخەنەوە لە تێگەیشتن و پێگەیشتن، لەبەر ئەوە پێویستە باڵاپۆش و رووپۆش لابەرین.

هەروەها ئافرەت لە چوارچێوەی ماڵ دەربهێنین. تا ئافرەتەکانمان ڕووناکی و ڕاستی ژیان ببینن چێشکەی سەربەستی بکەن بەم لەگەڵ خۆماندا بیان گێڕین بەناو کۆبونەوە تایبەتی و گشتییەکاندا، بە ناو بازاڕو دوکان و سەیرانگاو شوێنە نایابەکاندا بۆ چاوکردنەوەو بۆ تێگەیشتن. تا پێشکەون و نەتەوەکەشمان لە سایەی ئەوانەوە پێشکەوێ.

**سەرچاوە:**

**ئافرەتی کورد، شاکر فەتاح، چاپخانەی مەعاریف، بەغداد، ساڵی 1958، ل3-21.**

# ئافرەت چۆن دروست کراوە؟

هەسیوود

خوداکان هۆی ژیان لە مرۆڤ دەشارنەوە. تۆیش دەتتوانی، بێ ئەوەی ئەرك و ئازارێکت بێتەبەر، بەسایەی فرمانی ڕۆژێکتەوە، بەشی ساڵێکی تەواو بەرهەم بۆ ژیانی خۆت پەیدا بکەیت. بەڵام کە پیاو زۆردار بوو، ئەو کێڵگەیەی کە گاو ئێستر، بە ڕۆژان کاریان تێدا کردووەو، ماندووبوون تێیدا، دەیکات بە دەشتێکی کاکی بەکاکی کە هیچ بەرهەمێکی لێ پەیدانەبێ. هەروەها ڕۆژی وا لێدەکات لە تویی هەورەکاندا ئاوا ببێ. خوداکان هۆی ژیان لە (مرۆڤ) دەشارنەوە. ڕۆژێك لە ڕۆژان (زێفس) کە گەورەی هەموو خوداکانە، ئەو هۆیانەی لە (مرۆڤ) شاردەوە. ئەویش لە سەر ئەوە بوو کە (برمیثیوس)ی زۆرزان فرۆفێڵی لێکرد. (زێفس). ئاگری شاردەبووەوە. بەڵام (برومیثیوس) ئاگرەکەی لێدزی. بۆ ئەمەی مرۆڤایەتی کەڵکی لێوەربگرێ. ئەمیش ئاگرەکەی لە لوولە قامیشێکدا شاردەوە، نەوەك (زێفس) کە خودای هەورەتریشقەو کۆمەڵە هەورەکانە ئاگای لێی بێ و چاوی پێبکەوێ. ئینجا کە (زێفس) پێی زانی بە تووڕەبوونێکەوە قیژاندی بەسەریدا، پێی گوت: (برومیثیوسەکەی لە هەموو کەس زۆرزانتر!.. وام دێتە بەرچاو کە دڵت خۆشە بەوەی منت چەواشەکردووەو ئاگرەکەت لێدزیوم. دەك خۆت و ئەو کەسەی کە دەبێت بە جێنوشینت لەناو مرۆڤدا، تووشی دەردێك ببن کە لێی گەورەتر نەبێ!.. هەرچی (مرۆڤیشە،/ لەجیاتی ئاگرەکە دیارییەکی پڕ لەئازاریان پێدەبەخشم!.. دیارییەکە، شتێکی وا دەبێ، کە دڵی هەموویان پڕ بکات لە خۆشی. خۆیشیان هەست بەوە ناکەن کە ئەوەی دەیگرنە باوەشیان، دەبێتە هۆی سەرگەردانییان!..).

ئا بەم ڕەنگە بوو، کە باوکی مرۆڤ و خوداکان قسەی لە دەم دەرپەڕی. ئینجا بە دەنگێکی بەرزەوە دەستی کرد بە پێکەنین. پاش ئەوە فەرمانیدا بە خودای بەناوبانگی ئاگرەکە کە زوو بە زوو گڵ و ئاو تێکەڵ بە یەکتر بکات. پاش ئەوە دەنگی ڕەگەزی مرۆڤ و هێزەکەی بخاتە ناو قوڕەکەوە، تا پەیکەری کچێکی جوان و شۆخ شەنگی لێپەیدا دەبێ، کە لەشێوەی دەموچاویدا لە (ژن خودا) نەمرەکان بکات. پاش ئەوە فەرمانیدا بە (ئەپینا) کە فێری درومانی بکات و چنین و نەخش و نیگارکردن لەسەر جل وبەرگ، بۆ ئەمەی بتوانێ هەموو جۆرە نیگارکردن لەسەر خۆی بچنێ و دروست بکات.. فەرمانیشی دا بە (ئەفرۆدیت)ی زێڕین. کە دڵنەرمیی و ئارەزووی بەتین و تاو خەم و خەفەت بخاتە مێشکییەوە، بەجۆرێکی وا کە هەموو ئەندامەکانی لەشی لەکەڵك بخات!.. فەرمانیشیدا بە (هیرمیس)ی سەرکردە، کە پەیام بەری خوداکان بوو، مێشکێکی وا بخاتە کەللەیەوە، کە هەرچی واتایەکی شەرم و ئابڕوو هەیە تێیدا نەبێ، سروشتێکی وایش بخاتە لەشیەوە، کە پڕبێ لە هەموو جۆرە چەواشەکردن و پێچ و پەنایەك!..

**ئافرەت سەرچاوەی هەموو دەردو خەمێکە!**

(زێفس) بەم ڕەنگە بوو، کە فەرمانیدا. ئەوانیش هەموو ملکەچییان بەرامبەری نوواند. تاوێکی پێچوو، خودای بەناوبانگی لەنگ، خودای ئاگر بەو شێوەیەی کە (زێفس) ئارەزووی کردبوو، پەیکەری کچێکی ئابڕووداری دروست کرد. (ئەڤینا)یش خاوەنی چاوە گەشە جوانەکان، کچەکەی ڕازاندەوەو، جل وبەرگێکی یەجگار ناوازەی لەبەرکرد.. بەڵام خوداژنی جوانی و ملکەچی، خاوەن شکۆی بەرزو پیرۆز، خشڵی زێڕینی پێبەخشی!.. کچە





دەرکەوانەکانی ئاسمانیش، کە خاوەنی قژە سەری دڵکێشکەرن. شاە کلاوێکیان کردە سەری، کە لە گوڵەکانی دەمی بەهار دروست کرابوو!.. (ئەڤینا)یش، بەژن و باڵاکەی، بە جل وبەرگ و بابەتی ناوازەو گەورەیی یەوە ڕازاندەوە.. بەڵام پەیامبەری خوداکان، دەروون و هەناوو مێشکی پڕکرد لە قسەی درۆو فڕوفێڵ و چەواشەکردن و، سروشتی پڕ پەنگ و پەراوێز، بۆ ئەمەی ئارەزووی (زێفس) بهێنێتەجێ، کە خاوەنی هەورەتریشقەی گرمەگرمدارە!..

پەیام بەری خوداکان، دەنگی خستە لەشیەوە. پاش ئەوە ئافرەتەکەیشی ناونا (بەنەدۆرا). هەر کەسێکیش لەسەر چیای (ئۆلیمپوس)دا دانیشتبوو، یارییەکی پێشکەش کرد.. جا ئەم ئافرەتە، بووە ژان لەو مرۆڤایەتییەی کە بەڕەنجی شانی خۆیان، نانی خۆیان پەیدا دەکەن! جا هەر ئەوەندە (زێفس) لەم داونانەوەیەی خۆی بووەوە، کە ئەوەندە بە وردی کردبووی، کەس بەرگەی جوانی و شەنگ و شۆخی کچەکەی نەدەگرت، کچەکەی بە

دیاری نارد بە(هێرمیس)ی گەورەدا، کە پەیام نێرێکی گورج و گۆڵی خوداکان بوو، بۆ (ئەبیمیثیوس)، ئەوەی بیر نەکەوتەوە کە (برومیثیوس)ی برای پێی گوتبوو: هیچ دیارییەك لە (زێفس)ی ئۆلیمپی وەرنەگریت. هەرچییەکیشی بۆ ناردبوو بۆی بنێرێتەوە، نەوەك لە دوا ڕۆژدا زیان بدات لە مرۆڤایەتی. بەڵام (ئەبیمیثیوس) پەیی بەوە نەبرد کە شتێکی زیان بەخشی وەرگرتووە، تا دیارییەکەی لە دەست (هیرمیس) وەرگرت و بردیە لای خۆی!..

هۆزەکانی مرۆڤایەتیش– تا ئەم کارەساتە ڕووی نەدابوو– بۆ خۆیان ڕاهاتبوون بەتەنیایی، لە پەنایەکدا، لەسەر زەویدا دەژیان. خۆیان دوورخستبووەوە لە کردەوەی خراپ و ئەرك و ئازارو فرمانی سەخت و نەخۆشی کاریگەر، کە لە کاتی فرمان کردندا تووشیان دەهات و توکی سەری سپیی دەکردن. بەڵام ئافرەت سەری گۆزەکەی لاداو، ئەم هەموو دەردو خەفەتانەیش کە لە ناو گۆزەکەدا بوون بڵاوی کردنەوە. بەم ڕەنگە، بەکردەوەکەی خۆی خەم و خەفەتی هێنا بەسەر مرۆڤدا!.. تەنیا (هیوا) مایەوە لە ناو گۆزەکەدا. لە ژێر لێواری گۆزەکەدا بوو. لەشوێنێکی شارراوەی بێوەیدا. هەرچەندێکی کرد باڵەکانی بدا لەیەك و بفڕێ و بێتەدەرێ بە ناو دەمی گۆزەکەدا، نەیتوانی. چونکە لێواری گۆزەکە کرتبووی، لەسەر فەرمانی (زێفس). خاوەنی زرێی ئاسنین و کۆمەڵی هەوران. بەم ڕەنگە گەلێك دەردو نەخۆشیی تریش لە دەمی گۆزەکە هاتنەدەرەوەو بە ناو (مرۆڤ)دا بڵاوبوونەوە. ئەوەیش سەرزەوی یە کە دەبینین پڕبووە لە گوناهو تاوان. زرێکانیش هەر وەها پڕبوون لەو گوناهو تاوانانە. دەردو نەخۆشی یەی هەر لەخۆیانەوە، بە ڕۆژو بە شەو بڵاودەبنەوە بەناو مرۆڤدا، بە بێدەنگی و بەهێواشی، سەرگەردانی دەهێنن بەسەریاندا. ئەویش سەبارەت بەوەیە کە (زێفس)ی ژیرو تێگەیشتوو، ئەوی لە قسەکردن بێبەش هێشتۆتەوە!..

**سەرچاوە:**

**ڕۆژو فرمان، ئەم نوسراوە: کۆنترین دەستوری ڕەوشت خووی تێدایە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، نوسیبنی هەسیوود، وەرگێڕانی شاکر فەتاح، چاپخانەی ئەسعەد-بەغداد، 1985، ل(10-12).**

# پڕۆژەی خوێندەواری کورد چییەو چ ئامانجێکی هەیە؟

(1)

مەبەس لە (پڕۆژەی خوێندەواری کورد) ئەوەیە: بەهۆی ووتار خوێندنەوەو، ووتار نووسین و، نووسراودانان و، نووسراو پەرچڤە کردن و بڵاوکردنەوەیانەوە، مێشکی هاونیشتمانە کوردەکان ڕۆشن بکرێتەوەو ئاڕاستەیش بکەرێن بۆ ئەمەی بە کەڵکی (کورد) و (کوردستان) و مرۆڤایەتی بێن، هەروەها مەبەس لە (پڕۆژەی خوێندەواری کورد) ئەمەیە: دەستی یارمەتی درێژ بکات بۆ هەموو خوێندەوارێك و، بۆ هەموو دەستگایەکی خوێندەواریو، بۆ هەموو کوردێکی داماوو لێ قەوماو کە هەڵبگرن یارمەتییان بدرێت و، لەوانەیش بن بە کەڵکی (کورد و کوردستان) و مرۆڤایەتی بێن ئامانی ئەم پڕۆژەیەیش پێشکەش کردنی خۆرشتی گیان و زاخاوی مێشك و ڕۆشن کەرەوەی دەروونە بۆ (خوێندەوارانی کورد). بزواندنی دەماری مەردایەتیی (خوێندەوارانی کورد)ە بۆ فرمان کردن، لە کۆڕی نیشتمانپەروەریدا بۆ (پێشکەوتنی کوردەواری).

هەروەها گەشەکردن بە (وێژە) و (زمانی کوردی)یە، کە پەل بۆ ناو هەموو زانست و هونەرێك بهاوێژێت و تێیدا بڵاوببێتەوە. دروستکردنی (خوێندەوارییەکی بڵاو) (نووسراوخانەیەکی نوێ)یە، کە بۆ هەموو لکێکی ژیان کەڵکی لێ وەربگیرێت.

پڕۆژەکە بریتییە لە (119) نووسراوی هەڵبژاردەو ناوازە، لەبەرهەمە هەرە گرنگ و هەرە بەناوبانگەکانی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات، کە دابەش کراون بەسەر (20) زنجیرە نووسراوی جوێ جوێدا.

نووسراوەکان بە پوختەی خوێندەواریی کۆن و نوێی جیهان دەژمێررێن. نووسراوەکان هەموویان لەلایەن (شاکر فەتاح) خۆیەوە گۆڕاونەتە سەر زمانی کوردی و عەرەبی بەشێوەیەکی وەهایش نووسراونەتەوە کە هەموو کەس بە ئاسانی تێیان بگات و، خۆشی و کەڵکیشیان لێ وەربگیرێت. تەنیا لەسەر خواستی هەندێك ڕۆشنبیران، ئەو نووسراوانەی خۆیشم دامنابوون کە بریتین لە (46) نووسراو، لە نوسراوانی پڕۆژەکە دانران، بە هەموویانەوە دەبێتە (165) نووسراو لە (20) زنجیرەدا.

## مێژووی پڕۆژەی خوێندەواری کورد

(2)

هەرچەندە ئەم پڕۆژەیە لە ساڵی 1967 دا ناوی نرا: (پڕۆژەی خوێندەواری کورد) و، لە پایزی ئەو ساڵەدا بڵاوکراوەیە، بەڵام لە ڕاستیدا سەرەتای دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1927 چونکە لە ساڵی 1927دا بوو کە یەکەم ووتاری خۆم لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا لە شاری (سلێمانی)دا بڵاوکردەوە، لە ژێر ناوی (هاواری وەتەنە

**(بەپێنووسی خۆی)**

خۆشەویستەکەمان)دا. (1) ئەوساکە تازە تەمەنم لە چواردە ساڵی تێپەڕی کردبوو. شاگردێکی پۆلی شەشەمی خوێندنگای سەرەتاییی یەکەمی سلێمانی بووم. ئەوساکە نووسراوانی کوردی لە ڕێژەی نەبواندا بوو بەزەییم بە نەتەوەکەماندا دەهاتەوە، کە نووسراوەکانمان وا یەجگار کەم بوون. لەبەرئەوە بە پێویستم زانی، منیش بەشی خۆم لەم مەیدانانەدا خەبات بکەم تا سامانی نەتەوایەتیمان لە کۆڕی خوێندەواریدا بێتە بەرهەم و گەشە بکات و پەرەبستێنێت. هەر لەوساڵەدا دوو نووسراوم دانا: (گۆرانیی کوردی) و ژمێر و هەڵهێنانی هەندێك مەتەڵی ژمێر (2) هەروەها (150) چامەیشم لە بەرهەمی بوێژەکانمان: (نالی) و (سالم) و (کوردی) و (حەریق) و (غەریق) کۆکردەوەو ناردم بە دیاری بۆ خودا لێ خۆشبوو (داماوی موکریانی) لە ڕەواندوز کە لە گۆڤارەکەیدا چاپیان بکات. (3) هەروەها زۆربەی چامەکانی بوێژی بەناوبانگ (مستەفا بەگی گوردی)یشم کۆکردەوەو، ناردم بۆ خوالێ خۆشبوو (کاك فەتحوڵڵا ئەسعەد) بە دیاری، لەسەر خواستی خۆی، کە لەسەر ئەرکی خۆی چاپیان بکات. (1)

لە ساڵی 1928یشەوە دەستم کرد بە نووسینی گەشتنامەکانم لە بابەت ناوچەکانی (کوردستان)ەوە کە هاوینان بۆیان دەچووم. لە ساڵی (1930)یشەوە دەستم کرد بە نووسینی (بیرەوەری) و (یادنامە)کانم لە ساڵەکانی 1932 و 1933 و 1934یشدا گەلێك ووتارم لە گۆڤارەکانی (هاوار) و (دیاریی لاوان) و (یادگاری لاوان) و ڕۆژنامەی (ژیان) بڵاوکردەوە. یەکەم نووسراویشم کە بریتی بوو لە چیرۆکی (خانووی تازە) لە ساڵی 1933دا چاپ کردو بڵاوکردەوە. ئەم چیرۆکە بۆ منداڵان دانرابوو. لە عەرەبییەوە گۆڕیبوومە سەر زمانی کوردی ئیتر لەوە دواوە هەر گۆڤار و ڕۆژنامەیەکی کوردی دەرچوو بێت و داوای ووتاری لێکردبم بۆم ناردووە. لەوانە گۆڤارەکانی (گەوێژ) و (نزار) و (هیوا) و (ڕۆژی نوێ) و (هەتاو) و (ڕووناکی) و (بەیان) و ئەستێرە) و (برایی) و (برایەتی) و (کاروان) و (شەفەق) و ڕزگاری) و ڕۆژنامەکانی (ژین) و (هەولێر) و (ژیان) و (برایەتی= تاخی) و (خەبات).. بە نموونە دەهێنمەوە.

لە ساڵی 1931 دا نووسراوخانەیەکی تایبەتیم لە ماڵی خۆمدا دامەزراند، ناوم نا : (نووسراوخانەی گوڵزاری کوردستان). بەرە بەرە هەرچیم دەست کەوت لە گۆڤار و نووسراوو ڕۆژنامەی کوردی، لە چاپکراوە، دەستنووس لەم کون و لەو قوژبن، لەم ماڵ و دووکان و لەو مزگەوت، لەو نووسراوخانەیەمدا کۆم کردنەوە. لە پایزی ساڵی 1967 ناوی پڕۆژەکەمم لە ڕۆژنامەی (برایەتی= التاخی)دا، ژمارە (29) و (30) بڵاوکردەوە، ناوم نا : (پڕۆژەی خوێندەواری کورد).

لە ساڵی 1968دا نووسراوخانەیەکم لە بازاڕدا دامەزراند بۆ هەمووان، ناوم نا: (نووسراوخانەی پرشنگ). لە ساڵی (1971) دا نووسراوخانەکەم گواستەوە بۆ گۆشەیەکی جیاکراوە لە خانووەکەی خۆمدا لە (سلێمانی). بەڵام ناوەکەیم گۆڕی و کردم بە: (نووسراوخانەی پڕۆژەی کورد). هەر لە سەرەتای تێکۆشانمەوە تا ئێستا (165) نووسراوم هێناوەتە بەرهەم. لەمانە (119) نووسراویانم لە زمانانی ترەوە کردووە بە کوردی (46) نووسراویشیان هی خۆمن، خۆم دامناون لە هەموویان تا ئێستا (64) نووسراو چاپکراوە بێجگە لەمانە تا ئێستا پتر لە (204) ووتاریشم بە کوردی و عەرەبی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردۆتەوە. (112) گوتاریشم لە (ڕادیۆی کوردی) لە بەغداد، (6) ووتاریشم لە (تەلەفزیۆنی کوردی)ی (کەرکوك) بڵاوکردۆتەوە. لە (6) نووسراویشدا کە بۆ (بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردی= المديرية العامة للدراسة الكردية) پەرچڤە کراوە، هاوبەشیم کردووە.




ئامانجی هەرە گەورەی پڕۆژەکەم ئەمەتا هەموو نووسراوەکانم لەچاپ بدات. بەڵام داخەکەم چاپکردن ئەمەندە بەگران دەست دەکەوێت و بە گرانیش دەکەوێتە سەرپڕۆژەکە، دەرفەرتێکی زۆر تەنگ و تەسکو پڕ تەنگ و چەڵەمەم بۆ ماوەتەوەو کە نووسراوەکانمی تێدا چاپ بکەم. لە ڕاستیدا چاپکردنی ئەم هەموو نووسراوانەم مەگەر هەر لەدەست دەسگایەکی چاپەمەنیی نیشتمانی بێت کە بیگرێتە ئەستۆی خۆی. لەگەڵ ئەمەیشدا هەر هیوام بە خودایە کە کارم بۆ ئاسان بکات لەسەر دەستی کاربەدەستە بەڕێزەکانی کوردستاندا. چونکە وەك زانیومە کۆشش لە ئارادایە کە دەسگای (ڕۆشنبیری و لاوان) لە ناوچەی (فەرمانداریی خۆیی کوردستان)دا، چاپخانەیەکی گەورە لە شاری (هەولێر)دا دابمەزرێنێ، بۆ یارمەتیدانی چاپەمەنی کوردی. کاشکێ ئەم ئاواتە زوو بهاتایە دی. تامنیش و کەسانی تریش لەم گیروگرفت و بارە ناهەموارە ڕزگارمان ببوایە. تا نەتەوەکەمان و نیشتمانەکەمان زووتر و زۆرتریش تیشکی خوێندەوارییان تێیا بڵاوببوایەتەوە چونکە (خوێندەواری) کە (زانیاری) و (کردەوەی بڵند)یش دەگرێتەوە تەنیا بنچینەیەکی سەرگرتنی هەموو کارێکی پەسەندو بڵندەو، بێ ئەویش هیچ کارێکمان سەرناگرێت و پێك نایەت. پێش ئەمەی ئەم بەشە لە نووسراوەکەمدا تەواوبکەم، بە پێویستی دەزانم سوپاسێکی گەرم و گوڕ لەگەڵ ڕێزمدا پێشکەش بە خاوەنەکانی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییانە بکەم کە ووتارەکانمیان بڵاوکردۆتەوەو، هەروەها سوپاس و ڕێز پێشکەش ئەو دەستگا ڕۆشنبیرییە کوردییانە بکەم کە ئێستا لە کاردان وەك: (دەسگای خوێندنی کوردی)و، (دەستگای ڕۆشبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی) و (دەستگای ڕۆشبیری و لاوان) و (دەستگای زانکۆی سلێمانی) و (1) (دەسگای تەلەفزیۆنی کوردی) و (دەسگای ڕادیۆی کوردی) کە هەریەکەیان بەپێی تواناییان یارمەتیی پڕۆژەکەمیان داوەو، تا ئەندازەیەکیش بەرهەمەکانمیان بڵاکردۆتەوە. بێجگە لەوە لە کانگای دڵیشمەوە لە خودا داوادەکەم زۆرتر سەریان بخات لەم کارە پیرۆزانەیاندا کە کەڵکێکی زۆری هەیە بۆ نەتەوەکەمان و نیشتمانەکەمان.

## ناوی ئەو نوسراوانەی
## لە ماوەی نێوان ساڵەکانی (1927) دەوە تا (1984) دامناون تا ئێستا (64) نووسراوم داناوە کە ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| 1-ژمێر هەڵهێنای هەندێ مەتەڵی ژمێر | ساڵی 1927 |
| 2-گۆرانی ی کوردی | ساڵی 1927 |
| 3-گەشتی شارباژێر | ساڵی 1929 |
| 4-گەشی پێنجوین | ساڵی 1930 |
| 5-یادنامەی. | ساڵی 1930 |
| 6-یادنامەی. | ساڵی 1931 |
| 7-یادنامەی. | ساڵی 1932 |
| 8-گەشتی سوریەو لوبنان | ساڵی 1932 |
| 9-گەشتی هەڵەبجەو هەورامان | ساڵی 1932 |
| 10-یادنامەی. | ساڵی 1933 |
| 11-گەشتی سرۆچك | ساڵی 1933 |
| 12-فەرهەنگۆك بە کوردی و ئینگلیزی | ساڵی 1934 |
| 13-کۆمەڵە ڕۆژنامەی خورماڵ | ساڵی 1940 |
| 14-کۆمەڵە ڕۆژنامەی باسەڕە | ساڵی 1942 |
| 15-کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ | ساڵی 1946 |
| 16-پرشنگ | ساڵی 1947 |
| 17-شەبەنگە بەڕۆژ | ساڵی 1947 |
| 18-گەورە پیاوان | ساڵی 1948 |
| 19-هاوڕێی مندالٚ | ساڵی 1948 |
| 20-فێربوونی زمانی کوردی و عەرەبی | ساڵی 1949 |
| 21-کۆمەڵە ڕۆژنامەی ئاکرێ | ساڵی 1950 |
| 22-نوسراوی ئاکرێ (بە عەرەبی). | ساڵی 1951 |
| 23-ئافرەتی کورد | ساڵی 1958 |
| 24-ژینی نوێ | ساڵی 1959 |
| 25-ئاوێنەی ژینم | ساڵی 1962 |
| 26-خوێندنەوەی باو | ساڵی 1962 |
| 27-هاواری پێشکەوتن 1 | ساڵی 1963 |
| 28-چیرۆکی مەم و زین لە تەرازودا | ساڵی 1969 |
| 29-یەزیدیەکان و ئاینی یەزیدی | ساڵی 1969 |
| 30-زێوەر | ساڵی 1972 |
| 31-مەلا کاکە حەمە | ساڵی 1972 |
| 32-بێ کەس | ساڵی 1972 |
| 33-داماوی موکریانی | ساڵی 1972 |
| 34-حاجی قادری کۆیی | ساڵی 1972 |
| 35-بیرەوەری و یادگار | ساڵی 1972 |
| 36-ژن هێنان لەناو کوردەواریدا | ساڵی 1973 |
| 37-گیروگرفتەکانی ڕۆشنبیریی کوردی و شێوەی چارەکردنیان | ساڵی 1977 |
| 38-المراه الکردیه | ساڵی 1977 |
| 39-هاواری پێشکەوتن / 2 | ساڵی 1977 |
| 40-مشاکل الثقافة الکریة وطرق معالجتها | ساڵی 1977 |
| 41-خودای هەژاران | ساڵی 1978 |
| 42-مێژووی پرۆژەی خوێندەواری کورد | ساڵی 1979 |
| 43-گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی و شێوەی چارەکردنیان | ساڵی 1980 |
| 44-ئاهەنگی ڕۆشنبیران | ساڵی 1980 |
| 45-خەباتی ڕۆشنبیران | ساڵی 1983 |
| 46-ڕێگایەك بۆ پێشکەوتن | ساڵی 1984 |
| *ناوبراو خۆی هەرئەوەندەی نوسیوە (ڕۆڤار) | |

## ناوی ئەو نووسراوانە تا ساڵی (1984) کردومن بە کوردی لەم ماوەیەدا (119) نووسراوم کردووە بە کوردی کە ئەمانەن:

**ئایینی** : 25 **نووسراوە**:

| | |
|---|---|
| 1-مووسا | دانالی |
| 2-کۆنفۆچیۆسی | هەنری تۆماس |
| 3-عیسا | فۆلتۆن ئۆسار |
| 4-رابیعەی عەدەوی | کامیل موحەمەد کامیل |
| 5-شێخ موحەمەد عەبدە | عوسمان ئەمین |
| 6-ڕۆژ و فرمان | هەسیودد |
| 7-بوودا | ئەحمەدول شەنتەناوی |
| 8-موحەممەد | موحەممەد بەدرەدین خەلیل |
| 9-ئایینی بەهائی | سەلمان حەلیم |
| 10-زەردەشت: | ئەحمەدول شەنتەناوی |
| 11-ئینجیلی یووحەننا بە کوردی | |
| 12-ئینجیلی یووحەننا بە عەرەبی | |
| 13-ئینجیلی لۆقا بە کوردی | |
| 14-ئینجیلی لۆقا بە عەرەبی | |
| 15-ئینجیلی مەتتا بە کوردی | |
| 16-ئینجیلی مەتتا بە عەرەبی | |
| 17-ئینجیلی مەرقۆس بە کوردی | |
| 18-ئینجیلی مەرقۆس بە عەرەبی | |
| 19-کردەوەی نێرراوان | |

| | |
|---|---|
| 20–زامەکان | |
| 21–خەوەکەی یووحەننا | |
| 22–زەبوور | |
| 23–پەندەکان | |
| 24–تەورات بە کوردی | |
| 25–تەورات بە عەرەبی | |

(2)

زرنگ کاری (سیاسی): 9 نووسراو:

| | |
|---|---|
| 26–نووسەرانی شۆڕش | سەلامە مووسا |
| 27–هەریەك جیهانە | وێندل ویلکی |
| 28–(کۆمار)ی ئەفلاتوون | ئەفلاتوون |
| 29–زرنگ کاری | ئەرەستوو |
| 30–ڕێشیلیۆ | ڕێشیلیۆ |
| 31–شاهزادە | نیکۆلۆمیکیاڤیللی |
| 32–بیروباوەڕی سەربەست لە زرنگ کاریدا | بەرنادشۆ |
| 33–یوتۆپیا | تۆماس موور |
| 34–پەیمانی کۆمەڵایەتی | ژان ژاك ڕۆسۆ |

(3)

وێژەیی: (11) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 35–هەڵبژاردەی چیرۆکی هیندی | موحەمەد عیتانی |
| 36–مەم و زین– ئەحمەدی خانی | موحەمەد سەعید |
| 37–گرۆزی | ئەلبەرتۆ مۆڕافیا |
| 38–پیاوی چارەنووس | بەرنادشۆ |
| 39–دۆن کیشۆت | سێرڤانتس |
| 40–ئەلیادە | هۆمیرۆش |
| 41–ئۆدێسە | هۆمیرۆس |
| 42–بەزمی خودایی | دانتی |
| 43–بەڵقیس کچەشای سەبەء | ساڵی 1933 |
| 44–خانووی تازە | کامیل کیلانی ساڵی 1933 |
| 45–چیرۆك بۆ منداڵان | کامیل کیلانی ساڵی 1933 |

(4)

| | |
|---|---|
| زانستی ڕەگەز: (5) نووسراوە: | |
| 46–زیندوێی ڕەگەز | بەرنار ماکفادن |
| 47–دڵداری ژن و مێردی | موحەمەد فائیقول جەوهەری |
| 48–دڵداری، ڕەگەز، ناپاکی | لویس بیش |
| 49–سۆسان ئەنتۆنی | هەنری و داناتۆماس |

| | |
|---|---|
| 50–جوانیی ئافرەت | لویس ستانلی |

(5)

دادپەروەران (5) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 51–ئەبراهام لینکۆڵن | قەدری قەلعەچی |
| 52–جەمالەدینی ئەفغانی | قەدری قەلعەچی |
| 53–مەدحەت پاشا | قەدری قەلعەچی |
| 54–سەلاحەدینی ئەیوبی | موحەمەد سەبیح عەبدولقادر |
| 55–ژیانی نەهرۆ | نەهرۆ |

(6)

زانستی خۆناسین: (16) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 56–هونەری سرەوت بە خۆدان | وێلفرید ئورثفیلد |
| 57–سامانێك بۆ دابەش کردن | ڤاش یۆن |
| 58–ڕێگای سەرکەوتن | والتەر. ب. پەتکین |
| 59–ترس | و.ج. ماکیراید |
| 60–کلیلی کەسایەتی | ڤەرجینیاکایس |
| 61–نیاز بەخشین بەخۆ | وولیەم فلیدینگ |
| 62–نوواندنی موگناتیسی | ئەبومیدنوش شافعیی |
| 63–خەولێکدانەوە | سیگمۆند فرۆید |
| 64–زانستی خۆناسین دەبێتە ڕابەر | ریجبنیاڵد وایڵد |
| 65–چۆن/ دەنوویت؟ | ئورثفیلد |
| 66–خۆت بپارێزە لە خەم | جۆن کەنەدی |
| 67–نەمێنێ شەرمنی | س.ە. تیر |
| 68–هەست بەکەموکوڕی کردن | ولییم والش |
| 69–نەمێنێ ماندوێتی | ماری بانیۆن ڕای |
| 70–دەمارتوندی | ویلفرید ئورثفیلد |
| 71–هونەری دۆستایەتی | س.ە. تیر. ب.أ |

(7)

تەندروستی: (5) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 72–لە خاکی ڕووتەکاندا | لوی شارل ڕوابێ |
| 73–باش بخۆ خۆش بژی | ج.ف.سکۆتس کلارك |
| 74–شێوەی ژاپۆنهی | مامۆستا کۆلینگرگ |
| 75–ڕێگاکەی من | ج.ب. مۆلەر |
| 76–لە خاکی ڕووتەکاندا | ڕۆجێیە سالاردین |

(8)

لەبەردەمم دادگادا: (6) نوسراوە:

| | |
|---|---|
| 77–سوکرات | ئەفلاتوون |
| 78–ڕاسپۆرتین | پاتریك هاستینگر |
| 79–کوشتویتی یان تاوانبار نیە؟ | ئەدگارلیست گارتن |
| 80–چەندوچوون کردن لەگەڵ وولتەر ڕاڵیدا | سێرپاتریك هاستینگر |
| 81–چارلسی یەکەم | سێرپاتریك هاستینگر |
| 82–کەینوبەینەی دریفوس | و.ت. ستید |

(9)

هونەرەکانی ژیان: (7) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 83–هونەری کارفرمان کردن | ئەندرێ مۆڕوا |
| 84–هونەری ژیانی خێزانی | ئەندرێ مۆڕوا |
| 85–هونەری کامەرانی | ئەندرێ مۆڕوا |
| 86–هونەری پێشەوایی | ئەندرێ مۆڕوا |
| 87–هونەری خۆش ڕابواردن لە تەمەنی پیریدا | ئەندرێ مۆڕوا |
| 88–هونەری دڵداری | ئەندرێ مۆڕوا |
| 89–هونەری ژن هێنان | ئەندرێ مۆڕوا |

(10)

زانستی پەروەردەکردن: (6) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 90–کیژە هەرزەکارەکان | پەزیشك سۆزان برونیە |
| 91–گیرورگرفتی ڕێککەوتنی ژن و مێرد | فەرناند ئیزانبێر |
| 92–گیروگرفتی هەرزەکاری | پزیشك ژۆلێت بۆتۆینێ |
| 93–کاتێ کە براو خوشکەکان بە گژ یەکدادەچن | پۆلیت کۆهن |
| 94–ئارەزوی دزی کردن لە دڵی منداڵان چۆن دەردەهێنین | ماریان ڕۆدۆرف |
| 95–ئیمیل | ژان ژاك ڕۆسۆ |

(11)

ژیانی هونەرمەندان: (5) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 96–مۆزار | هەنری تۆماس |
| 97–مایکڵ ئەنجێلۆ | هەنری تۆماس |
| 98–عومەر خەیام | مانویل کۆمرۆف |
| 99–مەریەمی مەجدەلی | فرانك سلۆتەر |
| 100–ڤۆلتێر | دانا و لی تۆماس |

(12)

خۆش ڕابواردن: (4) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 101–دەست خوێندنەوە | حیلمی موحەمەد |
| 102–یاریی جادوگەری | خەلیل سابا |
| 103–لێك دانەوەی خەو | هەربەرت هەسپرۆ |
| 104–پێکەنین پرشنگ دەدات لە ژین | شاکر فەتاح |

(13)

ڕاستی پەرستی (الفلسفه): (1) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 105–گفت و گۆی گەورە پیاوان | پاول ئەرنست |

(14)

زمان: (2) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 106–خوێندنەوەی نوێ– بەلتز | شاکر فەتاح 1934 |
| 107–گفت و گۆ بە ئینگلیزی و کوردی– بەرلتز | شاکر فەتاح 1984 |

(15)

نیشتمان پەروەران: (4) نووساروە:

| | |
|---|---|
| 108–دیڤالێرا | سین ئۆڤۆلین |
| 109–گاریباڵدی | هەنری تۆماس |
| 110–لویس پاستێر | دانالی |
| 111–مادام کوری | دانالی |

(16)

کارو پیشە: (3) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 112–بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم | ئەحمەد عەبدولئاخیرو ئەحمەد عیوەز سەلامە |
| 113–بەخێوکردنی هەنگ | موحیەددین شەریف دۆغرەمەچی |
| 114–باخچە ڕێك خستن | بەسیمە زەکی ئیبراهیم |

(17)

دواڕۆژی مرۆڤایەتی: (5) نووسراوە:

| | |
|---|---|
| 115–جیهان لە ساڵی 200 دا | بەرتراند ڕەسڵ |
| 116–پێش بینیی گەشەکردن | چارلس داروین |
| 117–ساڵی یەکەم | ڕۆبێر دیودۆنییە |
| 118–چارەی دڵداری (چیرۆکی جیهان لە ساڵی دوو هەزارەمدا) | هـ.ج. وێڵد |

تێبینی:

لەم ڕستەیەدا (5) نووسراوی لێ دەبچێ کە لە ساڵەکانی (1933) و (1934)دا پەرچڤەم کردوون و، لێرەشدا دەست نیشانم کردوون، ئیتر نووسراوەکانی تر کە بیتین لە (114) نووسراو لە ناوەند ساڵەکانی (1964) و (1977)دا، واتا لە ماوەی (14) ساڵدا پەرچەڤەم کردوون.

ش.ف

ڕستەی ناوی ئەو نووسراوانەی
لەگەڵ لیژنەکاندا کردوومن بە کوردی

من ئەم نوسراوانەم لەگەڵ لیژنەکاندا بۆ (بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی= المدير العامه للدراسه الكرديه) کردووە بە کوردی:

1–دروستی (الصحة) بۆ پۆلی پێنجەمی سەرەتایی ساڵی 1971 دا.
2–زاراوەی زانستی (المصطلحات العلمية) سەرەتایی ساڵی 1972 دا.
3–جوغرافیای سروشتی: بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی و وێژەیی 1973.
4–مێژووی شارستانێتی عەرەبی ئیسلامی: بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی وێژەیی ساڵی 1974.
5–پەروەردەی نیشتمانی بۆ پۆلی سێهەمی ناوەندی ساڵی 1983.

سەرچاوە:
دەستنوسێکی شاکر فەتاحی شەهید (56–59).












### چیرۆکی منداڵان

# خانووی تازە



بەرازێك بە بەرخێکی هاوڕێی گوت:

—نیازم هەیە خانوویەك بکەم و تیا بحەوێمەوە.

بەرخەکەش بە بەرازەکەی گوت:

—منیش یاریدەت ئەدەم، خانوویەك دەکەین هەردوکمان تیا دەحەوێینەوە.

ئینجا بەرازەکە بە بەرخەکەی هاوڕێی گوت:

—من عەرد هەڵئەدرم، خانووەکەی تیا دروست بکەین.

بەرخەکەش بە بەرازەکەی گوت:

—منیش دار لە درەخت دەبڕمەوە، خانووەکەی پێ دروست بکەین.

ئینجا بەرخەکەو بەرازەکە، لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە هەڵپەڕین.

بەرخەکە بە بەرازەکەی گوت:

—کاکە! لە کوێ خانووەکەمان دروست بکەین.

بەرازەکەش بە بەرخەکەی گوت:

—برام! خانووەکەمان لە ناوەڕاستی ئەم دارستانەدا دروست دەکەین

بەرخەکەش بە بەرازەکەی گوتەوە:

—دەی! برام با خانووەکەمان لە ناوەڕاستی ئەم دارستانە دروست بکەین.

کە بەرازو بەرخەکە چوون خانووەکەیان دروست بکەن، لە ڕێ قازێکی زیرەکیان پێگەیشت.. قازە زیرەکەکە لە بەرازەکەی دۆستی و بەرخەکەی هاودەمی پرسی:

—کوێوە ئەچن؟

بەراز و بەرخەکەش بەقازە زیرەکەکەیان گوت:

—پێوەین خانوویەك لە ناوەڕاستی ئەم دارستانەدا دروست بکەین.

قازە زیرەکەکەش بە بەراز و بەرخەکەی گوت.

—منیش خانووەکەتان لەگەڵدا دروست ئەکەم، ئینجا هەموویان پێکەوە تیا دەحەوێینەوە.

بەراز و بەرخەکەش بەقازەکەیان گوت:

—چۆن یاریدەمان دەدەیت؟

قازە زیرەکەکەش بە بەرازو بەرخەکەی گوت:

—بە دەنووکە درێژەکەم پووشتان بۆ کۆدەکەمەوە، درزو قڵیشەکانی خانووەکەی پێئەگرم، تا سەرما و باران کارتان لێ نەکەن.

ئینجا بەراز و بەرخەکە بە قازە زیرەکەکەیان گوت:

—ئەمە زۆر باشە، وەرە لە گەڵماندا پێکەوە خانووەکە دروست بکەین و هەرسێکیشمان بحەوێینەوە.

ئینجا بەراز و بەرخەکە و قازەکە هەرسێکیان ڕۆیشتن خانووەکە دروست بکەن.

لەڕێ کەروێشکە سپییە بچکۆلەی هاودەمیان پێگەیشت و لێی پرسین:

—ئەچن بۆ کوێ؟

ئەوانیش پێیان گوت:

—ئەچین خانوو دروست بکەین.

ئەویش پێی گوتن:

—منیش لە دروستکردنی خانووەکەدا یاریدەتان ئەدەم.

ئەوانیش پرسیانەوە:

—چۆن یاریدەمان ئەدەیت؟

کەروێشکە سپییە بچکۆلەیش گوتی:



-بەددانە تیژەکانم دارتان بۆ ئەقرتێنم و بۆتان ئەهێنمە ناو خانووەکەتانەوە.

ئەوانیش پێیان گوت:

-زۆر چاکە... زۆر چاکە... وەرە لە گەڵماندا خانووەکەمان ئەکەین و پێکەوە تیا دەحەوێینەوە.

ئینجا بەرازەکە و بەرخەکە قازەکە و کەروێشکەکە، هەر چواریان لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە هەڵپەڕین... لە پاشا بەرازو بەرخ و قازو کەروێشکەکە چوون خانووەکەیان دروست بکەن. لەپڕ کەڵەشێر بانگدەری هاوڕێیان پێگەیشت و پرسی:

-دۆستینە بۆ کوێ ئەچن؟

ئەوانیش گوتیان:

نیازی خانوویەکمان هەیە لە ناوەڕاستی ئەم دارستانەدا دروستی بکەین و تیابحەوێیینەوە.

کەڵەشێرە بانگدەرەیش گوتی:

-منیش یاریدەتان ئەدەم، با پێکەوە دروستی بکەین

ئەوانیش پرسیان و گوتیان:

-چیمان بۆ دەکەیت؟

کەڵەشێری بانگدەرەش گوتی:

-من خانووەکەتان بۆ پاك دەکەمەوە

ئەوانیش پێیان گوت:

-ئەمەیش چاکە

لە پاشدا کەڵەشێرە بانگدەرە پێی گوتن:

-ئەی ناتانەوێ لە خانووەکەتانا کاتژمێرێك هەبێ و درەنگ و زووی شەوو رۆژتان پیشان بدات؟ من ئەو کاتژمێرەم کە درەنگ و زوویی شەو و ڕۆژتان پیشان ئەدەم. ئەوە هەرمنم کە درەنگ و زووی شەوو ڕۆژ لە مرۆڤ بگەیێنم، هەر لەبەر ئەمەیش مرۆڤ ناویان ناوم: کەڵەشێرە بانگدەرە.

ئەوانیش قیژاندیان و گوتیان:

-ئەمە زۆر باشە، شت لەم چاکتر نەبۆتەوە، وەرە لە گەڵماندا خانووەکە دروست بکەین.

ئیتر پێکەوە هەموو رۆیشتن، هەتا گەیشتینە ناوەڕاستی دارستانەکە، کە گەیشتنە ئەوێ دەستیان کرد بە دروستکردنی خانووە تازەکەیان.. بەرازەکە عەردی هەڵدڕی، بەرخەکە داری بڕی، قازەکە بە دەندووکە درێژەکەی پووشی کۆکردەوە، تا درزو قلیشی خانووەکەی پێ بگرێ و سەرما کاریان لێنەکات، کەروێشکە سپییە بچکۆلەش لەوەیدا یاریدەی قازەکەی دا. مایەوە سەر کەڵەشێرەکە، ئەویش خانووەکەی پاك کردەوە.. کە خانووەکەیان تەواو کرد، کەوتنە شایی و زەماوەندەوە، هەموو بەجارێ هاتنە جۆش و خرۆش. لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە هەڵپەڕین... ئیتر بەرازەکە و بەرخەکە و قازە زیرەکەکە و کەروێشکە سپییە بچکۆلەکەو کەڵەشێرە بانگدەرەکە، هەموو پێکەوە لەناو ئەو خانووە تازەیدا دەژیان.. هەمو شەوو رۆژێکیان بە کەیف و خۆشییەوە ڕادەبوارد.. لەبەرە بەیاندا، زوو هەموو ڕۆژێك کەڵەشێرە بانگدەرە، لەپێش هەتاو کەوتندا خەبەری دەکردنەوە، تازوو دەست بکەن بەکارو فرمانی خۆیان. کەڵەشێرە بانگدەرە، هەموو ڕۆژ لە بەرەبەیان دا ئەیخوێندو پێی ئەگوتن:

هەڵسن لە خەو     عوو عوو عووعوو
بێ فەڕ مەبن     عوو عوو عووعوو
دەستکەن بەکار     زوو بە زوو
هەڵسن لەخەو عوو عوو عوو

**سەرچاوە:**

دەستنوسێکی شاکر فەتاحی شەهید ل(192-195).

# چیرۆکی ژیانی
# مایکل ئەنجیلۆ

(مایکیل ئەنجیلۆ) هونەرمەندێکی گەورەی ئیتالیایە، لەساڵی 1475دا لەشاری (فلۆرەنسە)دا لەدایك بووە. بە بەرهەمە هونەرییەکانی خۆی لەوێنە کێشان و پەیکەرتاشی و نەخش ونیگار هەڵکەندن و پەیکەر دارشتندا کەڵکێکی گەورەی بەخشیوە بەهاونیشتمانەکانی خۆی و هەموو جیهان. لەچروچاوو سەرو پۆتەلاك و بەژن و باڵا و جل وبەرگدا خەواڵوو و پێستی و ناشیرین و کەم تەرخەم بووە. دڵیشی یەجگار ناسك بووە، بەڵام گرفتاری جوانی و ڕاستی و دروستی بووە لەپێناو ئەوانەیشدا هەموو گیان و سامانێکی خۆی بەخت کردووە. بەڵام نەخێزانەکەی بەدڵ بووە، نە کۆمەڵایەتییەکەی، نە ڕەفتاری نەتەوەکەی. چونکە پڕبوون لەزۆرداری و نەخوێندەواری و بەدکرداری. توندوتیژ پەروەردە کراوە: دڵی بەرگەی تیرو توانج و بەربەرەکانێ و، چاو پێهەڵهێنان و بەد گۆیی و، زەبرو، زەنگ و، ناهەمواری و، ژیان بەخشی و، ناشێتی و نەزانی و، بەدخوویی ناوچەکەی خۆی نەگرتووە! پێیاندا هەڵشاخاوە، چۆتەوە بەگژیانداو، تۆڵەیشی لێکردوونەتەوە! لەبەرئەوە (مایکیل ئەنجیلۆ) تاما دڵی لەمرۆڤ ڕەش بووبوو. لێی بەئازار بوو، هەرگیز چاك نەدەبووەوە. بەزەیی بەخۆیدا دەهاتەوە. چونکە تێکرا ژیانێکی تەنیایی و بێ دۆست و یاری و، بێکەس و کاری پڕ دڵتەنگی و خەم و خەفەتی ڕادەبوارد. نە ئەو سامانە گەورەیەی کە بۆی کۆبووبووەوە، نە ئەو ناوبانگ و پایەگەورەیەی کە لە هونەرەکانیدا دەستی کەوتبوون، ئەوانە هیچیان نەیاندەتوانی لەو دڵتەنگی و خەمبارییە رزگاری بکەن. کەچی لەسەرێکی تریشەوە ئەو گەنجینەی بەرهەمی هونەرییەی کە پێشکەشی ئیتالیا و جیهانی کرد، سەری هەموو کەسێکی هێنابووە سەرسوڕمان. دڵی هەموو هۆشمەندێکی پڕ لەشادمانی کردبوو.

(ئەنجیلۆ) هونەرمەندێکی تاقانە بوو. هەر لەتەمەنی چواردەساڵییەوە بلیمەتی دەرکەوتبوو. ئەوبەرهەمی هونەرەکانی خۆی لەسەر بنچینەی بیروباوەڕەکانی خۆی دادەمەزراند. نەك هی ئەم و ئەو. ئەو بایەخی بەڕاستی پەرستی و زانستی دەروون و کردەوەی بڵند دەدا لە بەرهەمەکانیدا. نە هێزی دەسەڵاتداران و نە پارەی دەوڵەمەندان کاریان لە بڕیارەکانی نە دەکرد. بۆ ڕاستی و دروستی و دادپەروەری نەبێ. سەری بۆ هیچ هێزێك دانەدەنەواند.



جارێکیان کابرایەك چاوی پێهەڵهێناو بەدگۆیی بۆ کرد لای پاپا. تا پاپای لە بەڵێنەکەی خۆی بەرامبەر ئەنجیلۆ پەشیمان کردەوە. بەڵام ئەنجیلۆ ئەمەندە سەربەرز بوو، بەرەنگاری پاپای کرد، تا سەری پێدانەواند!.. پاپا ناچارما ئاشتی کردەوەو تۆڵەی شکاندنی بەڵێنەکەی خۆیشی بۆ کردەوە!.. باوکیشی کە زەبروزەنگێکی زۆری لێدەکرد، کە بیکات بە بازرگان، لەگەڵیدا تێکچوو و لێی هەڵگەڕایەوە. وەك خۆی ویستی (هونەر)ی کرد بەپیشە بۆ خۆی، نەك بازرگانی!.. کەچی لەگەڵ ئەو هەموو شاهکارە گەورانەیشدا کە بۆ کڵێساکانی ڕۆماو فلۆرەنسەی کرد، کە هەتا ئێستایش نیشتمانەکەی خۆی شانازییان پێوە دەکات و، هونەرمەندەکانی ئەوسای جیهانیش چاویانی پێهەڵدەهێنان ئەنجیلۆ لە سەرەمەرگدا داخی دڵی خۆی بۆ کەشیشەکەی خۆی وا هەڵدەبەوست دەیگوت: (داخەکەم وا دەمرم و نەگەیشتم بەکامی خۆم، کە لە هونەرەکاندا تەواو قاڵ ببم!..). ئەو دەمەی پیری هونەرمەند ئەم قسانەی دەکرد تەمەنی لە 89 ساڵ تێپەڕی کردبوو. واتا لە ساڵی 1564دا گیانی پاکی بەخاك سپارد. بەڵێ لەمێژوودا هەر وا رووی داوە: هەموو دەم پیاوی هونەرمەند لەچینەکەی خۆیدا تووشی پیاوانی بەدگۆو چاوپێهەڵهێنەرو نامەردو ناپاك هاتووەو، بوونەتە هۆی ئازاردان و ژیانی. بەڵام لە ئەنجامدا هونەرمەندەکە سەرکەوتووە بەسەر ئەواندا. واتا

بیروباوەڕەکانی هونەرمەندەکە پەسەند کراوە، کردەوەو کارەکانی دوژمنەکانیشی ڕیسوا کراون.

میکیل ئەنجیلۆیش ئەو پیاوە گەورەیەیە کە هونەرەکانی خۆی گەیاندە ئەوپەڕی جوانیو پاکیو چاکی، کە پایەی هونەرمەندی نیشتمانەکەی خۆی پێ بەرز کردەوە. هەرچەندە دوژمنەکانی ئازارێکی زۆریان داو زیانێکی زۆریشیان پێگەیاند، بەڵام ئەوان بە بەدناویەوە لە ناوچوونو ئەمیش بەسەرکەوتوویی و سەربەرزیو چاکیەوە ناوی مایکڵ. ئێمەیش بۆیەکا پێویستیمان بەخوێندنەوەی مێژووی ژیانی ئەم جۆرە هونەرمەندانە هەیە، کە وایان بەسەر هاتووە. تا لە خەبات کردن بۆ کەڵکی نیشتمانەکەمان وەرس نەبین.

جا بەم نیازەوە منیش نوسراوی (میکیل ئەنجیلۆ) کە بەدەستی مێژووناسو ڕاستی پەرستی جیهانی (هەنری تۆماس) دانراوە، پێشکەش دەکەم. هیوادارم بەخودا کە خوێندەوارە بەڕێزەکانی کورد، بەتایبەتی هونەرمەندەکانمان، کەڵکێکی تەواوو خۆشییەکی زۆری لێ وەربگرن. هەروەها ئاواتەخوازیشم کە وێنەی (ئەنجیلۆ) یان زۆر تێدا هەڵبکەوێ بۆ بڵندکردنەوەی سەری نەتەوەکەمان.

شاکر فەتاح

خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد)

سلێمانی 20-2-1966




## شاگرد بەسەر مامۆستادا سەردەکەوێ!

(لیۆناردۆ داڤینشی) بەناو کوڕی (دیللا ترینتیا)دا دەڕۆیشت لەشاری فلۆڕەنسەدا. بەرووکەشە ڕێکوپێکەکەی خۆیەوە، بە زەردەخەنە دڵکێشکەرەکەیەوە دەنازی. لەو کاتەدا چاوی بە کۆمەڵێك لە هاونیشتمانە ناسراوەکانی خۆی کەوت، لەسەر نەختێکی ناو کۆڕەکەدا دانیشتبوون. لەبابەت پارچە هۆنراوەیەکی بوێژە گەورەکەیانەوە، (دانتی) قسەیان دەکرد، لەو کاتەدا یەکێکیان سەری هەڵبڕیو چاتوی بەو کەوت. ئەویش بە گەرمێکەوە پێی گوتن: (گەورەکان.. ئا ئەم پیاوەیە بتوانێ ناوبژی بکاتو وتوویژەکەمان بڕێنێتەوە!). لەو کاتەدا لەوپەڕی کۆڕەکەوە لاوێك دەرکەوت. بەلووتە فشە شکاوەکەیو دەمو چاوەکەیدا دیاربوو کە دڵی پڕبووبوو لەپشمو قین بەرامبەر هەموو جیهان!.. قژە بژە کورتەکەی سەری بەناڕێكو پێکییەکەوە بەسەر ناوچەوانیدا هاتبووە خوارەوە. جلوبەرگەکانی شڕوپڕبوون، ناڕێكو پێك بوون، کەم تەرخەمییان پێوە دیاربوو. پێڵاوەکانیشی تۆزی بەردە مەڕمەڕی بە سەرەوە کۆببووبووەوە. دەستەکانیشی وشكو ڕەق بوون، بەنینۆکەکانیشیەوە هێشتا وردە دەرمان مابوو. (لیۆناردۆ داڤینشی)یش پەنجەی بۆ ئەو لاوە کێشاو بەهاوڕێکانی خۆی گوت: (گەورەکان، ئەوا میکیل ئەنجیلۆ هات.. ئەو لە هەموو کەس چاکترە کە هۆنراوەی (دانتی)تان بۆ لێك بداتەوە!.).

بەڵام ئەنجیلۆ کە هەموو دەم دڵی ناسك بوو و، زوو هەستی بە ڕیسواکردن دەکرد، یاخود زوو قسەی بەخراپ هەڵدەگێڕایەوە سەرخۆی، قسەکانی لیۆناردۆی بە هوروژمێکی ڕاستەوخۆ دانا بۆ سەرخۆی. لەبەرئەوە بەتیزی پێکردنێکەوە قیژاندی بە سەریداو گوتی: (نەء ، من بۆیان لێك نادەمەوە، تۆ پێویستە ئەو هەڵبەستەیان بۆ لێك بدەیتەوە.. چونکە تۆ هەموو شتێکت لێ دەوەشێتەوە. ئەی ئەوە نەبوو نموونە ئەسپێکت دروست کردو خۆت لێکێشایەوە، هەر لەبەرئەوەی کە دەسەڵاتی ئەوەت نەبوو دایبڕێژیت لە پارچە زەردێکدا؟.). پاش ئەمەی میکیل ئەنجیلۆ داخی خۆی ڕشت کە ئەمەندە بەخت ڕەش بوو لەژیاندا. ملی ڕێی خۆی گرتو ڕۆیشت. ئەوساکە هێشتا لاوێکی نە ناسراوی ددان پیانەنراو بوو، لە چاو لیۆناردۆدا، کە بیستو سێ ساڵ بە تەمەن لەوە گەورەتربوو. بێجگە لەوە لەڕێزەی شارەزایانی هونەری ئەو سەردەمەیش دەژمێررا. بەڵام ئەو کاتە بەبیر ئەنجیلۆدا نەدەهات، کە ڕۆژێك دێو لەو بەبەرەکانێ کەرەی خۆی دەوڵەمەندتری لێدێو گەورەتریش دەبێ..

## زیانی وا هەیە کەڵکی لێپەیدا دەبێ!.

باوکی میکیل ئەنجیلۆ کە ناوی (لۆدۆ فیکۆ دی لیۆناردۆ بیوتارووتی) بوو، کوێخای (کابرێن) بوو، کوڕەکە لە ناو خێزانێکدا گەورە بوو بوو کە هەموویان نێرینە بوون. چونکە مایکیل هەر چوار برای هەبوە. تەنانەت کە دایکیشی مرد، ئەو تەمەنی شەش ساڵان بوو. هەرچی باوکی بوو، هەرچەندە خانەدان بوو، بەڵام دەست کورت بوو. زۆر ڕۆژ بێکارو فرمان دەمایەوە. جا لەبەرئەوە توندوتیژی لێهاتبوو لەگەڵ منداڵەکانیدا بە زەبروزەنگ بوو، زاڵ بوو بەسەریاندا. سەختی دەنواند. بەتایبەتی لە هیچ زۆر تووڕە نەدەبوو لەوە نەبێ کە میکیل ئەنجیلۆی کوڕی هەر دەیگوتو دەیگوتەوە: (دەمەوێ ببم بە هونەرمەند)! چونکە (لۆدۆ) وای بڕیاردابوو کە نە هێڵێ کەس لە خێزانی (بیوناروتی) بێ بیری ئەو بە کارو فرمانی پڕو پووچەوە خۆی خەریك بکات، وەك:

وێنەکێشان بە ڕۆنی ڕەنگاوڕەنگ و فڵچەو بەردتاشین بەچەکوشەوە. داینابوو هەر پێنج کوڕەکەی خەریکی کاروباری بازرگانی پارە گۆڕینەوە بن. ئەوانیش وەك کوڕانی خێزانە گەورەکانی فلۆرەنسە گوزەران بکەن. بەم ڕەنگە باوکەکە دەیویست کوڕە خەواڵووەکەی خۆی بەزەبرو زەنگەوە رابهێنێ. دەیویست گیانەکەی خۆی بکات بە بەریدا کە حەزی لە کاروبار هەڵسووڕاندن دەکرد!. بەڵام باوکی هەر ڕەنجێکی لەگەڵ دا بەبا چوو. هەرچەند لێی دەداو هەڕەشەی لێدەکردو لێی تووڕە دەبوو، ئەم هەر لەسەر قسەی خۆی دەڕۆیشت. هەر دەیویست ببێ بە (هونەرمەند)!. کە کار گەیشتە ئەم ڕادەیە، ئیتر لەوە بەولاوە باوکی سەری نەکردە سەری. ناچار ما خستیە (پەیمانگای هونەری سەرلانداگۆ)وە. ئیتر دەستی لێشت!. (میکیل)یش ئەوکاتە لەسیانزەساڵان تێپەڕی نەکردبوو. لەو کاتەیشدا (شەرلانداگۆ) خەریکی وێنەکێشان بوو، لەسەر دیوارەکانی کڵێسای (سانتاماریا). ئەویش ئەوەی سپارد بەشاگردە تازەکەی: (میکیل)، کە داوودەرمانی ڕەنگەکانی بهاڕێتەوەو، هەندێ وێنەیش لەنموونە وردەکانیان بگوێزێتەوە سەر دیوارەکە، کە وەستاکەی لەوەپێش ئامادەی کردبوون. وێنەکانی شاگردەکە ئەمەندە جوان و ڕێك وپێك دەرچووبوون، لە وێنەکانی مامۆستاکە ناوازەتر بوون، کە میکیل لەوانەوە گوێزابوونیەوە، (شەرلانداگۆ) ئەم هونەرمەندیەی میکیلی زۆر پێناخۆش بوو. چاوی پێهەڵنەهێنا. لەبەرئەوە لەشێوەیەکی زۆر نەنگ و ناشیریندا تەنگەتاوی کرد!. شاگردە دڵناسکەکەیش هەستی بە دڵ ڕەشی مامۆستاکەی خۆی کرد، کە چ جۆرە هەستێکی ناکەس بەچانەی لەدڵدایە بەرامبەری. هەروەها کردەوە پڕ زۆرو ستەمەکانی باوکیشی بیرکەوتەوە، کە چۆن لەوەپێش دەینالان بەدەستیەوە.. ئەو بەدخویی و زۆرداری‌یانە کارێکی وایان لە دڵی کرد، میکیل تا گەورە بوو و پێگەیشت، وردە وردە باوەڕی بە خۆشەویستی مرۆڤایەتی نەما.. جا ئەم دوو دڵی‌یەی لە خۆشەویستی مرۆڤ لە کۆڵ نەبووەوە. لەگەڵیدا مایەوە، تاما لەژیاندا!..

لەڕاستیدا ئەمە بۆ (میکیل ئەنجیلۆ) بەچاکە گەڕا، کە مامۆستاکەی لەم شێوەیەدا دڵی ڕەنجاندو لە کۆڵ خۆی کردەوە. ناردیە کن مامۆستا (بەرتۆلدۆ)ی هاوڕێی. ئەم ماۆستایەیش پیاوێکی پیربوو. شاگردەکانی خۆی فێری پیشەو هونەری بەردتاشین دەکرد، لەسەر نموونەی ئەو پەیکەرە جێماوانەی کە تازە لە (باخچەی میدیچی)دا دۆزرابوونەوە، جا ئەو جێگایە بەلای میکیل ئەنجیلۆوە وەك (بەهەشتی عەدەن) وابوو. چونکە لەوێدا فێری ئەو هونەرە بوو کە خودی دەستەکانی ئەوی هەر بۆئەوە دروست کردبوو. هەر لەوێشدا بوو کە گەیشت بەو پیاوە کە خستیە ناو جیهانی خوێندەواری و هونەرو سازوئاوازو هۆنراوەو جوانی و قسەی نەستەقەوە. کە خستیە ناو ئەو بابەتانەوە کە گیانە لاوەکەی ئاواتەخوازیان بوو ڕۆژێکیان میکیل ئەنجیلۆ لە باخچەکەی (لۆرێنزۆ دی میدیچی)دا بەردتاشی‌ی دەکرد خەریکی هەڵکۆڵینی دەموچاوی پیاوێکی پیربوو. بە ڕێکەوت (لۆرێنزۆ)ی بەناوبانگ خۆی لەو باخچەیەدا گەشتی دەکرد. لۆرێنزو وەستاو تاوێك لەو پەیکەرە پچکۆلەیە ورد بووەوە. پاشان ڕووی کردە پەیکەرتاشە لاوەکەو پێی گوت: (کوڕی خۆم.. تۆ ئەوە نازانیت کە پیاوی پیر چەند ددانێکی هەر دەبێ کەوتبێ؟). کە ئەوەی بیست دەم‌ودەست لاوەکە چەکوشەکەی گرت بەدەستەوەو ددانێکی پەیکەرەکەی شکاند ئینجا ڕووی کردە لۆرێنزۆ لێی پرسی: (ئاوات دەوێ؟).. لۆرێنزۆش پێکەنی و پێی گوت: (بەڵێ دەبێ وابێ!..).

سەرچاوە:

میکیل ئەنجیلۆ، چیرۆکی ژیان و خەباتی هونەرمەندی هەرە گەورەی ئیتالیا، میکل ئەنجیلۆ، نوسینی هەنری تۆماس، وەرگێڕانی شاکر فەتاح، چاپخانەی سەرمەد- بەغداد، ساڵی 1982.



# ڕیشیلۆ، لە کەشیشێکی سادەوە بۆ سەرۆکی کاربەدەستانی فەڕەنسا

## گەنجینەی دڵ باشترە لە گەنجینەی گیرفان

ڕیشیلۆ

**پێشەکی***

لە سەردەمی شانزەهەمدا (فەرەنسە) دەینالاند بە دەست زۆرداری و کەم تەرخەمی فەرمانڕەوایی فەرەنسەوە، لە ڕاستیدا ئەو هەر بە ناو (فەرمانڕەوایی) بوو. لە ڕەفتاردا هۆزەکی بوو.. خزمایەتی و هۆزایەتی و لایەنگیری تێدا بەکاردەهێنرا.. کەڵکی گشتی لە ئارادا نەبوو. کەڵکی ئاپوختەی تایبەتی ئامانجی هەموان بوو.. هەرچی دزو درۆزن و دوو ڕوو و بێئابڕوو بو، ئەوە لە پێش بوو.. نە (دادپەروەری) بایەخی پێدەدرا، نە (یاسا)، نە (فەرمانڕەوایی).. هەر کەسە بۆ خۆی بوو.. هەر کەسە بۆ خۆپەرستی و پوول پەرستی خۆی هەوڵی دەدا.. لە بەرئەوە نەتەوەی بەسەزمانی (فەرەنسی). ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو (نە خۆشی)و (هەژاری)و (نەخوێندەواری) دەڕۆیشت.. جا لەو سەردەمەدا (نەتەوەی فەرەنسە)ی هەژارو لێقەوماو، داماوی دەستی کاربەدەستێکی زرنگی بەچنگ بوو، کە لە سەر یاسایەکی (دیموکراسی)و (خوداناسی)و (دادپەروەری)، فەرمانڕەوایی‌یەکە ببات بە ڕێوە، تا کاروباری گشتی ڕاست ببێتەوەو نەتەوەیش سەرلەنوێ ڕووبکاتەوە گەشی و خۆشی و سەربەرزی جا خودا (ڕێشیلیۆ)ی بۆ ڕەخساند، کە لە ناوەند ساڵەکانی (1585–1642)دا ژیا..

(ڕیشیلیۆ) هەرچەندە لە خێزانێکی هەژاری خانەدانا لەدایك بوو بوو، بەڵام توانی خۆی پێبگەیێنێ و، فەرەنسەیش بە ئاواتەکانی خۆی بگەیێنێ. لە کەشیشێکی بچووکەوە بە هۆی خوداناسی و فرمان پەرستی و نیشتمان پەروەری و چالاکی‌یەکەیەوە، توانی خۆی بگەیێنێتە پایەی (سەرۆکایەتی کاربەدەستانی فەرەنسە). شارەزاییەکی زۆریشی پەیدا کرد لە زانستەکانی (ئایین)و (سەربازی)و (وێژە)و (زرنگ کاری)و (فەرمانداری)و بە هۆی ئەو زانستانەوە کە بەکاری دەهێنان خەباتێکی هەژدە ساڵی مەردانەی کردو، وازی نەهێنا، تا فەرەنسەی لە دەست درێژی پیاوانی کۆشکی شاهو، لووتبەرزی خانەدانە زەوی‌دارە گەورەکان و، سەرکێشی (هیکۆنۆت)ەکان و، بەرەڵڵایی فەرماندارانی ناوچەکان رزگار کرد. هەروەها ڕێزگرتن لە (یاسا)و (دادپەروەری)و (کەڵکی گشتی)و (یەکێتی فەرەنسە)یشی فێری هەموان کرد. بە هۆی نیشتمانپەرستی ئەوەوە (فەرەنسە) لە ناوەوەو، لەدەرەوەیشدا بووژایەوە، هێزو هەڕەتی پەیداکردەوەو، سەریشی بەرز کردەوە. بێجگە لەوە (ڕیشیلیۆ) گەشەیشی کرد بە خوێندەواری: پشتی زانایان و وێژەوانانی دەگرت و، یارمەتی دەدان. خۆیشی نووسراوی دادەناو وتاریشی بڵاو دەکردەوە. (زانکۆی فەرەنسە)یش هەر ئەو دایمەزراند.


ڕیشیلیۆ
ژیان و ئامۆژگاری یە زرنگ کاری یە کانی
کار بە دەستی هەرە گەورەی فەرەنسە ، ڕیشیلیۆ ، کە بە کاردینال
خوانتراز ناودەبرا ( لە گۆڤاری « کتابی » یەوە وەرگیراوە )
وەرگێڕی :
شاکر فتاح
زنجیرەی نووسراو : ( ٥٠ ) . بەغداد .

طبع بمطبعة الجامعة – بغداد – شارع المتنبي هاتف : ٨٨٨٨٥١٣

(ڕیشیلیۆ)، هەرچەندە دوژمنەکانی، کە یەجگار گەورەو بەچنگ بوون و، بە خوێنڕێژیان دادەنا، بەڵام لە ڕاستیدا لە کاربەدەستە هەرە گەورەکانی (فەرەنسە)و (جیهان) دەژمێردرێ. خودا ناسی‌یەکەی و، دادپەروەی‌یەکەی و، کارامەیی‌یەکەی لە ڕاپەڕاندنی فرمانە گشتی‌یەکانیدا، لەگەڵ (ئامۆژگاری‌یە–زرنگکاریی‌یەکان)ی، کە لە کاتی سەرەمەرگیدا پێشکەشی (لویسی سیانزەهەم)، خونکاری فەرەنسەی کردبوو، ئەمانە هەموو، چاکترین بەڵگەن بۆ ئەوەی کە (ڕ یشیلیۆ) پیاوێکی بلیمەت و ژیرو تێگەیشتووو هونەرمەندو نیشتمان–پەروەرو چاکەخوازو کارگوزار بووەو، خۆیشی لە پێناو (ئازادی)و (کامەرانی)ی نەتەوەکەی خۆیدا بەخت

کــردووه. نیشــتمانی ئێمــەیش شایســتەی ئەوەیــە کــە ئــەم نووسراوە پێشکەشی خوێندەوارە بەڕێزەکانی بکەم. بۆ ئەمەی کەڵك و خۆشی لێوەربگرن.

**شاکر فەتاح**

## گەنجینەی دڵ چاکترەلە گەنجینەی گیرفان**

**لەو زۆرتریش دەمێنێتەوە!؟..**

(هێریش لە هەموو پێویستییەك گرنگترە بۆ گەورەیی خونکاران و بۆ کامەرانی نەتەوەکانیان لە بەرئەوە پێویستە لەسەر هەموو کەسێك کە فڕی بەسەر زرنگ کاری فەرمانڕەواییەوە هەبێ، هەڵە یاخود گوناهی وا نەکات، کە لە هێزو دەسەڵاتی سەرۆکە هەرە گەورەکەی خۆی کەم بکاتەوە، یان سەری پێ دابنەوێنێ لەبەرچاوی جیهاندا. جا هەروەك ئامانجی خۆشەویستی. چاکە کردنە، هەروەها هێزیش دەبێتە هۆی مەترسی. ئەو ترسەیش کە لە هەڵسەنگاندنی کارو کردەوەوە پەیدا بووبێ و، لە ڕێزگرتنەوە، وا لە هەموو کەسێك دەکات، کە ئەوە بە چاك بزانی بۆ خۆی، کە لە هەموو کردەوەو کارێکی خۆیدا، دڵسۆزی خۆی پیشان بدات بەرامبەر سەرۆکی فەرمانڕەوای. هەروەها بێگانەیش چاوترسێن دەکات کە ڕایەیان نەکەوێت، ناوی سەردار بە خراپە ببەن، یاخود زیانێکی پێبگەیەنن.. جا ئەگەر هێزو دەسەڵاتی فەرماندار لە هەڵسەنگاندنی کارو کردەوەکانییەوەو، لە ڕێزگرتنی کەسایەتییەکەیەوە پەیدابووبێ، مەترسییەکی گەورەی لێپەیدا دەبێ.. چونکە فەرماندارەکان هەرگیز ئەوەندە ناکەونە مەترسییەوە وەك ئەوەی تووشی خەشم و قین و نەنگەویستی ژێردەستەکانیان ببن. چونکە ئەوان وا باشترە کە لە ئەندازەیەکی پەسەندا لێیان بترسن!..

ئەو دەسەڵاتەیش کە فەرماندار دەستی دەکەوێ و، ئەوەیشی بۆ پێك دەهێنێ کە نەتەوە لە هەڵسەنگاندنی کاروبارییەوەو، لە خۆشەویستنییەوە، کۆی لێبکەنەوەو لێی بترسن چەند هێزو زەبرو زەنگێکی تێدا کۆدەبێتەوە، کە لە یەکتری جوێ چوێن ئەو دەسەڵاتەیە چەشنی درەختێکی کە چەند لق و پۆپێکی هەبێ و هەموویان لە بنکێکی گشتییەوە خۆرشت وەربگرن. کەواتە پێویستە سەردار یاخود فەرماندار هەموو دەمێك ناوبانگی بە باش دەربچێت ژمارەیەکی بە ئەندازەیش سەربازی لە ژێر دەستدا بێت کە ئامادەبن بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی. هەروەها ئەوەندەیش زێڕ لە ناو گەنجینەکەیدا بێ کە بە کەڵکی ئەوە بێت کاروباری لە ناکاوی پێهەڵبسوڕێت.. پاش ئەوە، لەدوایی ئەوانە، هەموویشیان، بتوانێ دڵی نەتەوەکەی خۆی کێش بکات جا ئەگەر بێتو لەسەر ئەوڕێ و شوێنەی کە لەوەپێش دامنابوو سامانەکانی فەرمانڕەوایی کۆبکرێتەوە نەتەوە دەکەوێتە ئاسایشێکی تەواوەوە. ئەوساکەیش سەردار لە سەر بنچینەی دڵڕاگرتنی ژێردەستەکانی خۆی، دەسەڵاتەکەی خۆی دادەمەزرێنێ. چونکە ئەوانە کەتێگەیشتن سەردار چاودێرییان دەکات و بە تەنگیانەوەیەو خەمی چاکەیان دەخوات هەر لەبەر کەڵك و چاکەی تایبەتی خۆیان خۆشیان دەوێ.

خونکارەکانی پێشوو ئەم بنچینەیەیان بە شتێکی یەجگار گرنگ دادەنا بۆ هێزو دەسەڵات دامەزراندنی خۆیان.. یەجگار پێیشییەوە دەنازین.. هەرچەندە گەنجینەی دڵان، ئیمڕۆ بەشی ئەوەندە ناکات کە دەسەڵاتی خونکاران زۆرتر لێبکات، بەڵام ئەوەیش بە تەواوەتی ئاشکراو دیارە کە گەنجینەی زێڕ، بەبێ ئەو گەنجینەی دڵانە، بێنرخ دەمێنێتەوە. واتا، ئەگەر دڵسۆزی و خۆشەویستی نەتەوە بەرامبەر خونکارو فەرمانڕەواییەکەی بێنرخ دەمێنێتەوەو، هیچ کارێکیشی پێ نابرێتە سەرا!..

دوایی: لە بەرئەوەی فەرماندارەکان ناچارن فرمان ئەوەندە بکەن کە لەو فرمانانە زۆرتربن کە بۆ خۆیانی دەکەن، کە لە ئەندازەی کارگوزاری خۆیشیان زۆرترین، بێگومان زۆرتریش تووشی لێ پرسینەوەو، گلەییکردن و، چەندو چوون کردن دێن لە سەر ئەو کاروبارانەی کە ستییان تێدا کردوون. ئەوانە لە کەسانیتر، لە بۆرە پیاوان، زۆرتر لێپرسینەوەو چەندوچوونیان لەگەڵدا دەکرێ، لەسەر هەڵەکانیان.

ئەوانیش وەك هەموو کەسێك، تووشی هەڵەو کەم تەرخەمی دێن. بەڵام لەبەرئەوەی باری چاودێریکردنی چاکەی گشتی بەسەر شانیانەوەیە، هەر سستییەك لە هەڵسوڕاندنی ئەو کاروبارانەدا بنوێنرێ، بە تاوان و گوناه لە سەریان دەژمێررێ.

جا ئەگەر فەرماندارەکان کەم تەرخەمییان کرد لەوەدا کە هەموو ڕەنجێك بدەن لە پێناو فەرمانداریکردن بەسەر هەموو چین و دەستەکاندا.. ئەگەر لەوەدا سستییان نواند کە چاکترین ئامۆژگاری کار بدۆزنەوە بۆ خۆیان، تا ڕاوێژیان پێبکەن.. یان ئەگەر بە چاوی سووکەوە سەیری کاربەدەستانی خۆیان کردو بایەخیان پێنەدان.. ئەگەر پێیان نەکرا خۆیان بکەن بە نموونەیەك بۆ کردەوەی شیرین و کاری

ڕەنگینو کەسایەتی‌یەکی بڵندو پەسەند لە ناو نەتەوەکەی خۆیاندا.. ئەگەر لە دامەزراندنی دادپەروەریدا خۆیان ماندوو نەکرد.. ئەگەر لە پاراستنی بێتاوانو بێگوناهاندا کاریان بۆ نەچووە سەر، ئەگەر لە پاداشدانەوەی کارگوزارانی کۆڕی کاروباری گشتیدا هونەریان نەنوواند.. ئەگەر لە سزادانی گوناهباری سەرکێشدا سستی‌یان پیشاندا.. ئەگەر دووربینیو خۆئامادەکردنیان بۆ سەرگەردانی ناکاو، خستە پشت گوێوە.. یاخود خەمخۆری ئەو ڕۆژەیان نەکرد، کە دوورنیە شەڕو ئاژاوە بەرپابن.. ئەگەر کاربەدەستو یارمەتی دەرەکانیشیان لەسەر ئەو بنچینەیە هەڵببژێرن بۆ پایە هەرە بەرزەکانی فەرمانڕەوانی، کە سەر بەخۆیان بن، نەك هەڵ بگرن پایەی وا بەرزیان بدرێتێ.. ئەگەر پشتی فەرمانڕەوایی‌یان وا بەهێز نەکرد کە جێگای هەرە باش بکرێت لە ناو فەرمانڕەوایی جیهاندا، کە هێزێکی پەسەند لە ژێر چنگیدابێ.. ئەگەر ئەو سەردار یاخود فەرماندارانە، لە هەموو جێگاو ڕێگایەکدا، لە هەموو کاتێکدا، چاکەی گشتی‌یان نەخستە پێش چاکەی تایبەتی خۆیانەوە..

ئەگەر ئەو سەردارانە وایان نەکرد.. بێگومان تاوانباری‌یەکی وا دەنوێنن‌و گوناهی وا دەکەن، کە لە تاوانو گوناهی ئەوانە خراپترو توندو تیژتربن کە فەرمانو یاساکانی خودایی دەشکێنن ئەمانە بام خۆیشیان لە ژیانی تایبەتی خۆیاندا ڕاستو پاك بن، لە لێپرسینەوەی خودایی‌و نەتەوەیی ڕزگاریان نابێ!..

**سەرچاوە:**

**ڕیشیلیۆ، وەرگێڕانی شاکر فەتاح، مطبعة جامعة- بغداد، زنجیرەی ژمارە( 50 ).**

**پەراوێزەکان:**

* **پێشەکی کتێبەکە ( نوسینی شاکر فەتاح ).**

** **بەشێکە لە کتێبەکە.**



# ئافرەت
# لە پشت گەڵای توودەوە!..

لویس بیش

لەڕاسـتیدا ئـەوەی دڵـی پیـاوان کێـش دەکـات بـۆ ئافرەتـە سۆزانیو سووکەکان ئەوەیە: ئەوەی لە دەست ئەوان دێت، خانمە ئاساییەکان لە دەستیان نایەتو نایشوێرن بیکەن!.. ئەوانە شتی وا پیشانی پیاوان دەدەن کە ئافرەتـە خـاوەن ڕەوشـتە باشـەکان، پێیـان شـەرمە، وەك ئـەوان بکـەن!.. دەتوانـین بڵـێین، جوانـیو چاوبەست کردنی سۆزانییەکان لەوەوەیە، کە لەشو لارە شەنگو شۆخەکەیان لـە شـێوەیەکی جـادوو گەرانـەدا پیشـان دەدەن. لـە سەرەتای دروستکردنی ئافرەتدا، چۆن لە پشت گەڵای توووەوە ئەو لەشە ناسـکە دەردەکـەوت، ئـەمانیش بـەو جـۆرەی دەردەخـەن!..



سۆزانییەکە دەزانێ پیاوان دەیانەوێ خۆشی لە لەشی وەربگرن لـە بـەر ئـەوە ئـەویش تـا پێـی بکـرێ، ئارەزوویـان دەبزوێنـێو، ئارەزوویشیان دادەمرکێنێتەوە!.. لەو کاتەدا کە پیاو دەزانێ لە لایـەن ئـافرەتی ڕەوشـت پاکـەوە چ کردەوەیـەك ڕوودەدات سۆزانییەکەمان وا دێتـە پێـش چـاو کـە پیاوەکـە لـە هەڵـهێنانو هێنانە پێش چاودا دەهێڵێتەوە. بەڵام لە هەر تاوەدا، شتی وای لە خۆ پرسـینیش دوو کەرەسـتەی گرنگـن لـە دڵداریـدا. هـەروەها گرنگیشن لە چیرۆکدا!.. بێجگە لەوە سۆزانییەکە، گـوێ ناداتـە ڕەوشتو خووی کۆمەڵایـەتی، سەرکێشـی دەکـات لـە بـەندەکانی (یاسا)و (ئایین)، پشـت ئەسـتوورە بـەخۆی لەبەرئـەوە پـڕ پێچو پەنایە، دڵی پڕ لەگرێیە، بە ئاسانی دەرناکـەوێ. هـەروەها زوو زوویش دەگۆڕێن. جا لەبەرئەوەیە کە ئافرەتە لاساییکەرەوەکان دەبینـین هـەموو دەم حـەز بـە لاسـاییکردنەوەی ژیـانو ڕەوشـتی سۆزانییەکان دەکەن!..

## هێزی ڕەگەزبازیو ساردوسڕی ئافرەت!..

تا ئێستا لایەکی ئەوانەمان دەرخست کە پیاوان دەخەنە سەر ناپاکی لەگەڵ ژنەکانیاندا. بـام لەمـەو دوایـش بگەڕێینـەوە سـەر گفتوگۆ گشتییەکەمان لـە بابـەت (ناپـاکی)یـەوە. هەرچـەندە ئـەو هێزانەی پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن بۆ خۆفڕێدانە ناو گیروگرفتەکانی ڕەگەزبازییـەوە، جۆرجۆرو تێکەڵو پێکەڵن، بـەڵام لـە تواناماندا هەیـە کـە بـە ئاشـکرای چـەند جۆرێکـی دیـاری کراویـان پیشـان بدەین: بۆ وێنە پیاوی وا هەیە کە تووشی ئەم جۆرە گیروگرفتانـە دێ، لەبەرئەوەیە کە هێزو هـەرەتێکی ڕەگـەزبازی زۆری هەیـە. جا چەشنی ئەم پیاوە، دوور نیە شانازی بەو هێزو تواناییەی خۆیەوە بکات. کەچی لەڕاستیدا، یەجگار دوورە لەوەوە کە هەر وەك خۆی دێتە پێش چاو وا بێ. چونکە ئەو لەڕاستیدا، لەئەندازە بەدەر ئەو هێزە بە فیڕۆ دەدات کە خۆی پێیەوە دەنازێ!.. جا ئەو کەسانەی کە بەم ڕەنگە بن، بە تایبەتی ئەگەر پیاویش بن، لەڕاستیدا بە هیچ دانانرێن، بە نـەخۆش نـەبێ. ئەوانـە دەمارەمێشـکییەکانیان تێـك چوونو ئازاریشی دەدەن. لەبەرئەوە پێویستیان لە دەرمان کردنو چاك کردنەوە هەیە!..

سـەیر ئەوەیە، ئـەو ژنانـەی تووشـی نەخۆشـی سـاردو سـڕی ڕەگەزبازی بوون، وەك دێنە پێش چاومان، لە هەموو کەس زۆرتر خۆیـان دەکوتن بۆ جەربەزەیی لە ڕەگەزبازیدا، هەروەك بە دەمی خۆیـان بڵێـن: (مـن بـاکم چییـە؟.. کـە مـن ڕەگـەزبازی ئەمـەندە بەلامـەوە بایـەخی نـەبێ، ئیـتر بۆچـی خۆشـی بـە کەسـانی تـر نەگەیـەنمو پـارەیش دەسـت خـۆم نەخـەم؟!.، کەواتـە سـوڕمانی پێنـاوێ، کـە ئەوانـەی لنگبـازی پیشـەیانە، واتـا ئافرەتـە سـۆزانییەکانو ژنـە داوێـن پیسـەکان، زۆربـەیان لـەم جـۆرە ئافرەتانەن!..

ئەو ئافرەتانەیش کە دەیانەوێ خۆیان دووربخەنەوە لە هەست کردن بە ڕەنجەڕۆیی لە کۆڕی ڕەگەزبازیدا، لە هەست کردن بە ڕووداوی سەخت و ناهەمواری ژیان، کە لە ئەندازە بەدەر خوو دەدەنە ئەندێشەو بە ئاواتەکانی دڵداری و ڕەگەزبازییشەوە خەو دەبینن، ئەوانە لەڕاستیدا خۆیان کز دەکەن بەرامبەر تاوکردن و دەماری ڕەگەزبازی بزواندن..

چونکە ئارەزوکردن، هەموو دەم دەبێتە هۆی بیرکردنەوە لە جێبەجێکردنی خۆی!. جا ئەو جۆرە ئافرەتانە، کە کەللەیان پڕە لەم جۆرە ئەندێشەو ئاوات و خەوانە، هەموو دەم لەوانەن کە بە ئاسانی ڕاوبکرێن لە لایەن ئەو پیاوانەوە کە زیرەك و زمان شیرینن، کە خاوەنی شارەزاییەکیشن لە دەروون ناسی و فرۆفێڵدا.

ترسی ئافرەتیش لە تەمەنی هەناسەساردی-کە ئیتر لەو کاتەوە خوێنی لێنایە- هەروەك ترسی پیاو وایە لە تەمەنی پیری. جا ئەم ترسەیش، زۆرجار بەڵکو زۆربەی جاران، دەبێتە هۆی بزواندنی ئارەزوو ئالۆش بۆ ئەمەی دواخۆشی ژیانی ڕەگەزبازی خۆی ببینێ!..

لەبەرئەوە، وەك بۆمان دەرکەوتووە، ناوەڕاستی تەمەن، بە تایبەتی لە ناوەند چل ساڵی و پەنجاساڵیدا، لە هەموو تافەکانی ژیان سامناکترو گرنگترن لە ژیانی هەردوو ڕەگەزدا. داوێن پیسی یش لەم بارەدا، جۆرە دەرچوونێکە لە ئەندازە، لە تۆڵەکردنەوەدا.. تۆڵەکردنەوە بۆ لەش، لەوەی کە خەریکە لێ بێبەش بمێنێتەوە؟.. چونکەلەم تافی ژیانەدا (هۆرمۆن)ەکانی ڕەگەزبازی دەست دەکەن بەکزبوون. جا بۆ ئەمەی مرۆڤەکە زاڵ ببێ بەسەر هەستکردن بە کەم‌وکوڕی خۆیدا، ئەو بەزەییەی کە لەلایەن خۆیەوە دێتەوە بە خۆیدا، پاڵی پێوەدەنێ کە چست و چالاکییەکی لە ئەندازە بەدەر لە کۆڕی لنگبازیدا بنوێنێ!..

یەکێ لەو هۆیانەیش کە ئافرەت دەخاتە سەر ناپاکی لەگەڵ مێردی خۆیدا، ئەوەیە کە ئەو ڕەنگە وای بێتەپێش چاو، کە ناتوانێ وەك جاران دڵی پیاوان کێش بکات. جا بێ ئەمەی هەست بە خۆی بکات، کارێکی وا بەخۆی دەکات کە دوایی پاڵی پێوەبنێ بۆ داوێن پیسی و ناپاکی. کەچی لەڕاستیشدا ئەو هەر ئەوەندەی دەوێ کە بزانێ هێشتا جوانییەکەی لەجێی خۆیدایەو کار لەدڵی پیاوانیش دەکات!.. جاری وایش هەیە بۆیەکا ناپاکی لەگەڵ مێردەکەی خۆیدا دەکات، مێردەکەی بە داوێن پیس دەزانێ و دەیەوێ تۆڵەی خۆی لێبکاتەوە!. یاخود دەیەوێ تۆڵە لە ئافرەتێك بکاتەوە کە ئازاری دڵی دەدات و خۆی بەسەردا دەنوێنێ ئەویش بەوە تۆڵەی خۆی لەو ژنە دەکاتەوە کە مێردەکەی ئەو لە خشتەببات و داوێن پیسی لەگەڵدا بکات!..

هەرچی پیاوانیشن، هەندێ هۆی داوێن پیسییان ئەوەیە کە لە کەمتەرخەمی ژنەکانیان یەجگار تەنگەتاو دەبن. یاخود سەرکێشی لە ژنەکانیان دەکەن لەبەر سارد و سڕییان لە ڕەگەزبازیدا. جاری وایش هەیە پیاو بەوە دەکەوێتە داوی داوێن پیسییەوە، کە دەیەوێ خۆی بنوێنێ، لە ناو ئەو کەسانەدا کە لەگەڵیاندا کۆدەبێتەوە. دەیەوێ وایان تێبگەیەنێ کە خۆی پیاوێکی چاو بەستکەرەو ژنانیش لەبەرئەوە حەزی لێدەکەن!..

**کاروان دەڕوات بام بڕوات، بەڵام ئێوە خۆتان مەدەن بەدەستەوە!..**

بەشی زۆری کەسان (دڵداری) و (ڕەگەزبازی) تێکەڵ دەکەن. کەچی ئەو دوو پەیوەندییە لە گرنگترین پەیوەندییەکانی ناوەند نێرو مێن کە پێکیانەوە دەنوسێنن. ئەو گێروگرفتانەیش کە لەم تێکەڵی و پێکەڵییەوە ڕوو دەدەن، زۆر جاری وا ڕوو دەدات کە دەبنە هۆی قەومانی کارەساتی وا کە دەمارە مێشکییەکان تێکدەدەن، سەرگەردانی دەهێنن بەسەر کەساندا، بیروباوەڕو ئاواتەکانیش لەناو دەبەن، گەلێك کەسیش دەخەنە گێژاوی هەناسە ساردی و کڵۆڵییەوە!.

پزیشکی دەروونیش لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا، زۆر کەینەو بەینەی وای دێتە پێش چاو کە هەموویان لەوەوە پەیدابوون، لێقەوماوەکان لە جیاوازی ناوەند (دڵداری) و (ڕەگەزبازی) تێنەگەیشتوون!..

ڕۆژێکیان کچێکم ها تەلا. تەمەنی هەژدە ساڵان بوو. تووشی ئازارێکی زۆرو پەشیمان بوونەوەیەکی سەخت بووبوو. چونکە خۆی خستبووە بەردەست لاوێك کە بەناوی (دڵداری)یەوە لەخشتەی بردبوو.. هەندێ لەو قسانەی بە کچەکەی گوتبوو بە مەبەستی تاوکردنی ئەمە بووبوو: (کە هەر دووکمان دڵمان بەیەکتردا چووبێت و باوەڕیش بە یەکتر بکەین، ئیتر بۆ چ خۆمان لەم ئازارەدا بهێڵینەوە؟!.. کچە بەسەزمانەکەیش، بەقسەکانی ئەو دەسخەڕۆ دەبێ و خۆی دەدا بەدەستەوە. کچەکە ئەوەندە ساکارو نەشارەزا دەبێ لە پەندو پەراوێزی کوڕەکە، لەوەدا هیچ نەنگییەك نایەتە پێش چاوی، کە خۆی بدا بەدەستییەوە، (چونکە کوڕەکە خۆشی ویستووەو دڵی پێداچووە، خۆیشی باوەڕ بەوو بە بەڵێنەکانی دەکات!). کەچی لەپاش شەش مانگ کوڕکە ڕووی خۆی لێوەرگێڕاو خۆی لەگەڵ کچێکی تردا ڕێك خست!.. کچانی وایش هەن، بۆیەکا دەکەونە داوی واوە، کە وا هەست دەکەن، ئەگەر بێتو دەست بەڕووی هەموو لاوێکەوە بنێن ڕۆژێك دێ پیردەبن و شوویش ناکەن. جا بۆ ئەمەی هەلی شووکردنیان لە دەست نەچێ، هەر لاوێك زمان پاراوبێ و لە بابەت دڵداری و ژن هێنانەوە قسەی باشیان بۆ بکات، تاو ئەبن و خۆیانی دەدەن بەدەستەوە!. ڕەنگە ئەم جۆرە کارەساتانە بە سەیر دانەنرێن.

بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانی ڕاستەقینەیە ئەوەیە، کە زۆر لە ئافرەتە مێردارەکان، تا چەند ساڵێکیش بەسەر شووکردنیاندا تێدەپەڕێ، هێشتا لەوە تێناگەن کە جیاوازی هەیە لەناوەند (دڵداری) و (ڕەگەزبازی)دا!..

گەلێك ژن بۆم دەگێڕنەوە كە دڵدارییان بەرامبەر مێردەكانیان بە هۆی ئەوەوە تێكچووە كە لەپاش شەوی پەردەوە (هەموو شتێك) گۆڕراوە!.. هی وایان تێدایە، سكاڵا لەوە دەكات كە مێردەكەی لنگبازی زۆر لەگەڵدا ناكات و وەك جاران خۆی تێناگەیەنێ!.. ئەویش ئەمە بە نیشانەیەكی كەم بوونەوەی خۆشەویستی مێردەكەی دادەنێ، بۆیەكا دڵی لێی كرمێ بووە، كە خەریكی دڵدارییە لەگەڵ ژنێكی تردا!.. هی وایشیان تێدایە وا دێتە پێش چاوی كە دەست نەپەژرانی مێردەكەی بۆ بردنی ئەو لەگەڵ خۆیدا بۆ جێگای ڕابواردن و گەشتوگوزار، بەبیانووی كاروبار زۆرییەوە بەڵگەیەكە، كە دڵی مێردەكەی خۆی لێساردبۆتەوە!..

منیش لە یەكێك لەم جۆرە ئافرەتانەم پرسی كە دەهاتە شوێنی فرمانەكەم ئایا بەڕاستێتی كە مێردەكەی خۆشی ناوێ؟!.. وەرامەكەی ئەویش ئەمە بوو: (ئەو هەروا پێشان دەدات كە منی خۆش دەوێ. بەڵام من هەر چەند دەكەم باوەڕی پێناكەم!.. ئەو هەر دڵی بە لنگبازییەكەدا دەچێ، هیچی وایشی لێدەرنەكەوتووە كە لەوە بەولاوە هیچی تری خۆش بوێ!..). چیرۆك یەجگار زۆرە كە لەم بابەتەوە بگێڕرێتەوە، بەڵام هەموویان پەنجە بۆ كاكڵی گیروگرفتەكە دەكێشن كە بریتییە لەمە: (دڵداری) شتێكەو (ڕەگەزبازی)یش شتێكی ترە. ئەم دووانەیش لە لای هەر دوو ڕەگەزەكە ئەوەندەی یەكتر نین. هەروەها پلەی هەر دوو بابەتەكە، لە كن هەر ڕەگەزە جیایە لەگەڵ هچی ئەوی تردا!..

**دڵداری+ڕەگەزبازی= كامەرانی تاسەر!.**

ئەوەندە هەیە پیاوەكان لە ئافرەتەكان باشتر دەتوانن هەست بكەن بە جیاوازی ناوەند هەردوو تاسەكە. هەروەك بە سروشت پەی بەوە ببەن وایە. چونكە پیاو ڕەنگە ژنەكەی خۆی بە دڵ خۆش بوێ و، بە تەنگ ئەوەیشەوە بێ كە بەدڵسۆزی لەگەڵیدا بمێنێتەوەو ناپاكی لەگەڵدا نەكات، كەچی لەپاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك وای لێبێ، ئەوەندە گرفتاری جوانی لەشی نەبێ بەڵام ژن بە زۆری (دڵداری)و (ڕەگەزبازی) پێكەوە دەبەستێتەوە بەلای ئەوانەوە وایە كە هۆی خۆ بەدەستەوەدانەكەیان بۆ پیاوان دڵدارییەكەیانە بۆ ئەوان!.. واتا (دڵداری) دەكەن بە بیانوو بۆ خۆ بەدەستەوەدان!. جا ئەم هەست پێكردنە هەڵەیە، كە دەبێتە هۆی پەیدابوونی زۆر دڵشكاوی و، لەش تێكچوون، لە ناو ئەو كچانەدا كە هێشتا شوویان نەكردووە. كە تووشی خەم و خەفەت و ئازاریشیان دەكات لەپاش شووكردن!..

جا ئەگەر بێتو ئافرەتەكان ئەوە بخەنە پێش چاوی خۆیان كە پێویستە (پاڵ پێوەنەری ڕەگەزبازی)و (پاڵ پێوەنەری دڵداری) لەیەكتر جوێبكەنەوە، هەر كاتێ ڕووداوی ژیانیان بخستایە پێش دەمی ئەم جیاوازییەوە، ئەوەندە تووشی خەم و خەفەت و ئازار نەدەهاتن!.. چونكە ئارەزووی ڕەگەزبازی و، دامركاندنەوەی ئارەزووەكە، بێ ئەمەی دڵداری لەئارادابێ، بە ئاسانی پێك دێن.. ئارەزووی دڵداریش لەگەڵ دامركاندنەوەی ئارەزووەكەدا، بێئەمەی ئارەزووی ڕەگەزبازی لە ئارادابێ تەنانەت بێ ئەمەی لنگبازییش بكرێ، هەروەها پێك دێن!.. پاڵ پێوەنەری (ڕەگەزبازی) سەرچاوەكەی (لەش)ە. ئامانجەكەیشی (منداڵ) دروست كردنە،. بوون و چالاكیشی بەندن بە ئاو فڕێدانی لووە كەڕەكانەوە.

(پاڵ پێوەنەری دڵداریش) سەرچاوەكەی- كە بەجۆرێكی ساكار لێی بدوێین و دووریش بێ لەشێوەی زانستییەوە- سووچی (هەست)و 0تاسە)و (تەزوو)ە لە (هۆش)دا. ئەمەیش كارەساتێكی دەروونییە، لە بنج و بناواندا لەوەوە پەیدا بووە، كە ئافرەت ئارەزوو دەكات پشتیوانی پیاوی دەس بكەوێ، بۆ ئەمەی بتوانێ ئەو فرمانە بەجێبهێنێ كە سروشت بۆی داناوە، واتا (منداڵ) بوون و پەروەردەكردنی (منداڵ).

پێویست بەوەیش ناكات كە بڵێین: (دڵداری)و (ڕەگەزبازی) تێكڕا، لای زۆر كەس، لەژن و لە پیاو، تێكەڵ بە یەكتر دەبن. جا ئەگەر بەرهەڵستێك نەیەتە ڕێی ژنەكە، یان پیاوەكە، كە وایان لێبكات هەست بە تێكچوون و سەرنەگرتنی كاری ژن و مێردی، بەن، دەست بەجێ دەكەونە بارێكی واوە، كە ئەوەندە دڵخۆش و كامەران بن، ئەوەندە لەش خۆش و تەندروست بن، كە لە هیچ لایەكی تری ژیان و پەیوەندییەكانی مرۆڤایەتییەوە نەگەن بەو خۆشی و كامەرانییە. بۆ ڕۆشن كردنەوەی ئەم قسەیە دەڵێم: ئەگەر هات و ڕێك كەوت كوڕو كچێك، دڵدارییەكی دوولایی كەوتە ناوەندیانەوەو ئارەزووی ڕەگەزبازییشیان یەكیگرت، هەرچی ئەرك و ئازارو، خەم خەفەت و نەخۆشیی گیروگرفتێكی ئابووری و كۆمەڵایەتی هەیە، تەنانەت هەرچی ترسێكیش هەبێ لە بۆمبای گەرد.. بە لایانەوە بایەخێكی ئەوتۆی نامێنێ!. ئیتر ئەوساكە ژیانیان لێدەبێتە بەهەشت كە هەر حەز دەكەن تێیدا بمێننەوە!..

جارێكیان خانمێك لە بابەت دڵداری ئافرەتانەوە گفتوگۆی لەگەڵدا كردم، گوتی: (سروشت خۆشەویستییەكی وەهای لە ئافرەتدا دروست كردووە، هەر بەشی مێردەكەی و منداڵەكانی ناكات، بەشی باوك و دایك و براو خوشكەكانی و، منداڵەكانی، ناكات، بەشی باوك و دایك و براو خوشكەكانی و، دۆستەكانی و هەندێ لەو گیان لەبەرانەیش دەكات كە نازدارن لەلای، تەنانەت بەش هەندێ دارو بەردیش دەكات!..

بە لای منیشەوە خۆشەویستی پیاویش لە خۆشەویستی ئافرەت كەمتر نییە، خۆشەویستی پیاویش لە هەموو جۆرە خۆشەویستییەك ڕەنگاوڕەنگترو جۆر جۆر ترە. هێندە هەیە، پیاو وەك ژن بە ئاسانی و بە زوویی گرفتاری دڵداری ببێ. پیاو لە ڕاستیدا، لە ژن زۆرتر خۆی دەپارێزێ، زۆرتریش لێی ورد دەبێتەوە.. جا ئەگەر دوایی گرفتاری دڵداری بوو، واتا دڵداری ڕاستەقینە، حەز لە لەش و لاركردن، دڵدارییەكەی ئەوەندە بە هێز دەبێ، ئەوەندەیش بەرگە دەگرێ، تا مرد دەمێنێتەوەو نابڕێتەوە بە تایبەتی ئەگەر یارەكەی بووبێتە ژنی و، منداڵی لێی بووبێ و، بوو بێتە كەیبانووی ماڵیشی!..

**سەرچاوە:**

**دڵداری، ڕەگەزبازی، ناپاكی، نووسینی پزیشك لویس بیش، وەرگێڕانی شاكر فەتاح، چاپخانەی مەعاریف، بەغداد، 1984، ل(15-26).**

# سوسان ئەنتۆنی، ڕابەری ژنانی ئەمریکا

ئەم نوسراوە کە لە لایەن مێژوونوسانی بە ناوبانگ (هەنری)و (دانا توماس)ەوە دانراوەو، لە بابەت ژیانی (سوسان ئەنتۆنی)ی ئازادیی پەروەرو خەباتکارەوە ئەدوێ، چاکترین دیاری‌یە کە پێشکەشی خوشکە بە ڕێزەکانم. ئافرەتانی کوردی بکەم. چونکە (سوسان ئەنتۆنی)، کە کچێکی ئەمریکایی بو، هەر کە هاتە جیهانەوە لە ساڵی (1820)داو چاوی کردەوە، ئافرەت کارەکەرێك بو بە دەست مێردەوە. نە (سەربەستی)ی هەبو، نە (ماف)!. یاسای فەرمان ڕەوایی خاکە یەکگرتووەکانی ئەمریکایش (ژن)و (منداڵ)و (_سەگ)ی وەك یەك دانابو!. مافی دابو بە پیاو کە وەك سامانێکی خۆی تەماشایان بکات!. هەر کاتێکیش بە پێویستی زانی لێیان بدات!. جا لە ناو ناوچەیەکی وا پاش کەوتوو کۆنە پەرستو وشك مێشکا، (سوسان ئەنتۆنی) لە کۆمەڵایەتی ڕزیو ڕاپەرییو ڕەنجو تەقەلای داو خەباتی کرد، بۆ دەست کەوتنی سەربەستی‌یەکانو مافەکانی ئافرەت لە ئەمریکای یەکگرتوودا. بەلام تێکۆشانی (سوسان ئەنتۆنی) هەر بە تەنیا لە خاکەکانی ئەمریکای یەکگرتوودا نەبو، پەلیشی هاویشت بۆ خاکەکانی ئەوروپاو لەگەڵ ئافرەتانی هەموو جیهاندا خەباتی کرد بۆ سەندنی ئەو مافانە بۆ ئافرەتانی هەموو جیهان. (سوسان) لە پێناو ئەو خەباتە گرنگو مەردانەیەی‌دا وازی لە شوکردنو ژیانی ژنو مێردیو بەزمو ڕەزمی تایبەتی هێنا. پشتی لە سرەوتو ئارامو خۆش ڕابواردن هەڵکرد. هەموو خەباتەکانی خۆی ئاراستەی ئەو ئامانجە پیرۆزە کرد کە (ڕەگەزی ئافرەت) لە ئەمریکای یەکگرتوودا ئازاد بکات لە بەندەیی بۆ پیاوو یاسای کۆنی ڕزیوی کۆمەڵایەتی. جگە لەوە هەرچی سەربەستیو مافێك پیاو هەیەتی دەست ئافرەتانی نیشتمانەکەی خۆی بخات. (سوسان) تا گەیشتە تەمەنی (86) ساڵیو لە ساڵی (1906)دا گیانی پاکی بە خاك سپارد، لەم ڕەنجو تەقەلاو خەباتانەی خۆی وازی نەهێنا. نە گوێی دایە بەرەنگارییکردنی زرنگ کاران ڕۆژنامەکەران. نە باکی توانجو پلاری بەدگۆیانی هەبو نە بایەخی دا بە ماندوو بوونو زیان کردنو سەختی ژیان. کۆڵی نەداو، ورەی بەر نەدا، هەتا مردن لە خەبات کردن دا بو تا زۆربەی ئاواتەکانی خۆی هێنایە دی. واتا زۆربەی (ماف)و (سەربەستی)یەکانی بۆ ئافرەتانی ئەمریکای یەکگرتوو سەند.

ئافرەتە خوێندەوارەکانی کوردیش، کە ژمارەیان یەجگار کەمە لە چاو ئافرەتە نەخوێندەوارەکانماندا، بارێکی کۆمەڵایەتی زۆر گەورەو گرانیان کەوتۆتە سەر شان. کە ئەویش (پێ خوێندن)و (تێگەیاندن)و (پێگەیاندن)ی ئافرەتە نەخوێندەوارەکانمانە لەگەڵ ئاراستەکردنی خێزانانی کورددا بۆ ژیانێکی پاك ترو چاك ترو پێشکەوتووتر، کە پڕی بێ لە خۆشەویستیو دادپەروەریی. کە دووریش بێ لە بیروباوەڕی پڕو پووچو کردەوەو ڕەوشتیو داوە کە هۆش پەسەندی نەکات!. لە ڕاستی‌دا گەلێك ڕەوشتو خووی ڕزیوی کۆمەڵایەتیمان تیا پەیدا بوە لە کۆڕی





(میوانداریی)و (هەیتو هووتی ژن هێنان)و (پرسە)و (میوانداریی)و (ڕازاندنەوەی ماڵ)و (سامان پێکەوە نان)و (بەخێوکردنی منداڵ)و (کۆبونەوەکان)دا، کە دوورن لەهۆشی تەواوو دڵی تەڕو، گیانی بڵندەوە. چونکە پڕن لە خۆپەرستیو کەشو فشو خۆ نواندنو لە خۆ گۆڕینو لەنگەر ڕانەگرتنی ئابووریی و بەربەرەکانێو، لووت بەرزییو، خۆ ماندوو کردنو، ئازاردانی کەسانی تر.

ئەنجامی ئەمەیش بەوە گەیشتوە کە ژیانمان تاڵ بووەو، ناکۆکیمان کەوتۆتە ناوەوەو، ئاژاوەیشمان تیا پەیدا بووەو، خویشمان داوەتە کاری چەوت وەك دزییو ناپاکیو درۆزنیو کوشتن! بەلام ئەگەر ئافرەتەکانمان چاکی مەردایەتی بکەن بەلاداو، بێنە کۆڕی تێکۆشانەوە بۆ کەڵکی گشتی، بەشێکی زۆری خوارییو چەوتی کۆمەلایەتیمان ڕاست ئەبێتەوە. ژیانیشمان چاکترو گەش ترو خۆشتری لێدێ.

ئافرەتانی کورد لە چاو ئافرەتانی ئەمریکادا، کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا ژیاون، یەجگار مافو سەربەستییان دەست کەوتوە بگرە بە جۆرێکی تێکڕایی شتێکی وای نەماوەتەوە کە لەمافو سەربەستیدا بگەنە پیاو. بەلام ئەوەی نەتەوەی کورد لە سەری داماوە خەباتو تێکۆشینی خوشکە خوێندەوارەکانمانە کە ببنە سەرکردەی ئافرەتە نەخوێندەوارەکانمان لە کۆڕی پێشکەوتنی ڕاستەقینەدا. واتا لە کۆڕی ئەو ژیانەدا کە لە سەر بنچینەی زانستو هونەرو دادپەروەریی دامەزرابێ، نەك لەسەر بنچینەی ئاڵۆشی دڵ. ئەویش کاتێك پێك دێ، کە ئافرەتە خوێندەوارەکان لە پێشدا ئەم بیرو باوەڕانە لە ژیانی خۆیان دا بەکار بهێنن، تا خۆیان ئەکەن بە نمونەیەکی ڕاستو دروستو تەواو بۆ خوشکە نەخوێندەوارەکانیان. ئینجا پاش ئەوە ئەم بیروباوەڕانە لە ژیانی خوشکە نەخوێندەوارەکانیاندا بە کاربهێنن تا کۆمەلایەتییە چەوتو نەخۆشەکەمان ڕوو بکاتەوە ڕاستیو تەندروستی.

جا هیوادارم بەخوا کە لەناو ئافرەتانی کوردیشدا لە خەباتو تێکۆشیندا بۆ ئامانجی بەرزو پیرۆز. وێنەی (سۆسان ئەنتۆنی) زۆر هەڵ بکەوێ، تا نەتەوەکەمان ئەو پێشکەوتنە ڕاستەقینەیەی دەست کەوێ.

**سەرچاوە:**
**سوسان ئەنتۆنی، نوسینی هەنریو دانا تۆماس، وەرگێڕانی شاکر فەتاح، چاپخانەی کەمەرانی-سلێمانی، ساڵی 1970، پێشەکی.**

# عمر خيام،

# بوێژییەکەی خۆی لە پێناو کەڵکی گشتی دا بەخت دەکات

ئەوانەی (عمر خيام) لە چوار خشتەکی‌یەکانی‌یەوە ئەناسن بەلایانەوە وایە کە پیاوێکی مێباز، مەی بازو سازو ئاواز باز بووەو. هەموو ژیانی خۆیشی هەر بە جەربەزەیی و بەزمو ڕەزمەوە ڕابواردووە. بێجگە لەو بابەتانە فرِی بەسەر هیچ شتێکی ترەوە نەبوە!..

کەچی لە ڕاستی‌دا، لە سەردەمی خۆی‌دا بە زانایەکی گەورەو بە بوێژێکی خۆش ئاوازو، بەڕاستی پەرستێکی کارامە ناوی دەرکردووە. (عمر خيام) حەڤدە بەرهەمی وا گەورە گەورەو گرنگی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە، کە هەر یەکەیان لە کۆڕێکی زانست و وێژەو مێژوو و ڕاستی پەرستی و هونەردا جێگای خۆی لە ناو نوسراوخانەکانی جیهاندا کردۆتەوە. لە زانستگاکانی سروشت (طبيعت) و ژمێرکاریی (رياضيات) و ئەستێرە ناسی (تنجيم) و ڕاستی پەرستی (فەلسەفە) و وێژەو مێژوودا، چ بەزمانی فارسی، چ بە زمانی عەرەبی، (عمر خيام) نوسراوانی بە نرخ و گرنگی پێشکەشی شارستانێتی (ئێران) کردوە تەنانەت لە بابەت (تقويم)ی ئێرانی‌یش بە سایەی کۆششی زانایانەی ئەوەوە ڕاست کرایەوە.

## چوارینەکانی خیام

بەڵام (عمر خيام)، زۆرتر بە هۆی چوارینە (رباعی) کانیەوە ناوبانگی دەرکردوە لە جیهاندا، کە هیچ زمانێکی زیندووی جیهانی نەماوە ئەو (178) چوارینانەی ئەوی پێ پەرچڤە (ترجمە) نەکرابێ بە زمانی کوردی خۆیشمان، ئەم چوارینانە، بەشێوەی کرمانجی و شێوەی موکریانی، بە هەردوو شێوەکە کراون بە کوردی. جارێکیان لە لایەن وێژەوانی پایە بڵند و خەباتکار (دوکتۆر کامەران عالی بدرخان)ەوە، جارێکیشیان لە لایەن بوێژی خوا لێخۆش بوو (شێخ سەلام)ەوە کە هەردووکیان لەنیوەی یەکەمی ئەم چەرخەدا گۆڕیویانەتە سەر زمانی کوردی.

## پێگەییشتنی خیام

(عمر خيام) لە کاتی خۆی‌دا بەم ناوو نیشانەوە ناوی دەرکردوە: (حكيم أبو الفتح غياث الدين عمر كوڕی ابراهيمی خيام). لە ساڵی (407)ی کۆچی‌دا لە شاری (نەیشاپور) لە دایک بوە هەر لەم شارەیشدا لە ساڵی (517)ی کۆچی‌دا گیانی پاکی بە




خاک سپاردوە (عمر خيام) لە سەر دەستی پێشەوا (موفق)ی نەیشاپوری‌دا، لەگەڵ (نظام الملك) و (حسن الصباح)دا خوێندنی زانستکۆیی تەواو کردوە لە وتارەکانی زانای بە ناوبانگیش _ابو علی سينا) کەڵکی وەرگرتوە. هەر لەوساکەوە (بەڵخ) و (هەرات) و (ئیسپەهان) و (حیجان)یش کۆچی‌کردوە. کە هاتویشەتە کۆڕی ژیانەوە وەك خواناسێکی خەباتکارو، زانایەکی ڕۆشن بیرو، بوێژێکی دڵتەڕو دەروون ئازاد ژیاوە خۆی دوور ڕاگرتوە لە ڕووکەش و کەش و فشی جیهانی‌یەوە. خۆی لە کاربەدەستان هەڵ نەسووە. خۆی بە زانست و هونەرو وێژەو ڕاستی پەرستی‌یەوە خەریك کردوە. هەروەها بەتەنگ ژیانێکی خۆشی پڕ کامەرانی تایبەتی خۆیشی‌یەوە بوە. لە بەر ئەوە لە ناو دڵی نەتەوەداو، لە ناو دڵی شاهی ئێران (جلال الدينی سلجوقی)داو، لە ناودڵی سەرەکی کاربەدەستان (نظام الملك)دا جێگایەکی پەسەندی بۆ تەرخان کرابوو.

## خەباتی خیام

بەڵام چوارینەکانی (عمر خيام)، چونکە پڕبوون لە ڕاستی پەرستی‌یەکی مەردانەو ئازایانەو خۆیشی بەگژ خراپەکاریی و زۆرداریی و بەدخویی و ژیانی چەوت و چەوێڵی کۆمەڵایەتی‌دا چوە، هەموو دەم عمر خيام لە هەموو لایەکی ئێرانەوە دوژمنانی توندو تیژی بۆ پەیدا بوە. کە لە پاش مردنیشی ڕزگاری نەبوە لە دەمو زمانیان. لەگەڵ ئەمەیشدا مرۆڤدۆستی (عمر خيام و نیشتمان پەروەی‌یەکەی و گیانە سووکە پاکە پڕ بەزمو ڕەزمەکەی هەموو دەم پاڵیان پێوە ناوە، کە هەموو دەم کردەوەی چاکە خوازانە بنوێنێ لەگەڵ گەل و نیشتمانەکەی خۆی‌داو لەگەڵ

مرۆڤایەتیدا. هەروەها لە ژیانی تایبەتی خۆیشیدا پڕ بەدڵی خۆی دڵتەڕانە بە ئاهەنگو زەماوەندەوە ڕابوێرێ. جا هەر لە بەر ئەم هێزو تواناو کردەوە پەسەندانەو ڕەوشتو خووە بەرزانەی بوە کە (عمر خیام) چ لە سەردەمی خۆیداو چ لە پاش مردنی خۆیشی، هەموو دەم خۆشەویستو نازداری ئازادی خوازانی جیهان بوە.

### دڵداری خیام

ئەم چیرۆکەیش کە پێشکەشی خوێندەوارانی کوردی بەڕێزی ئەکەم هی نوسەری سینەمایی بەناوبانگی ئەمریکایی (مانوێل کۆمرۆف)ە کە لە شێوەیەکی زۆر خۆشو تەڕو تازەدا هەڵی بەستوە. بێگومان هەر چەندە هونەری خۆی تیا نواندوە، هەر چەندە دەستکاری خۆی تیا کردوە، بەڵام لەسەر چاوانی سەرگوروشتەکانی ئێرانەوە کەرەستەی چیرۆکەکەی خۆی وەرگرتوە. ئەمەیش شایانی گێڕانەوەیە: کە من خۆم ئەم چیرۆکەم لە فیلمێکی شۆخو شەنگو ڕەنگاوڕەنگدا دییوە لە سینەمادا.. چیرۆکەکە هەردوو ڕووی ژیانی (عمر خیام) بە جوانی پیشان ئەدات. ڕووی ژیانی تایبەتی، کە پڕە لە جەربەزەییو دڵدارییو بەزمو ڕەزم. ڕووی ژیانی گشتییشی کە پڕە لە مرۆڤ پەروەریو نیشتمان دۆستیو ڕاستی پەرستیو دادخوازیی، کە لە شێوەیەکی ژیرانەو مەردانەو گیان سووکانەدا بە کردەوە ئەینوێنێ.

### خیام صلاح الدینمان بیر ئەخاتەوە

جا لەم چیرۆکەدا کە (عمر خیام) بەنگ کێشە نهێن گرەکانو، (بیزانتی) یە داگیرکەرەکانو، دوژمنە تاوانبارەکانی ناوخۆی، بە ڕاوێژو ئامۆژگارییە نایابەکانی خۆی، کە پێشکەشی شاهی ئێرانی کردوە، لە ناو بردوەو تەفروتونا کردوە، خەباتو شاهکارەکانی (صلا الدینی ایوبی) شاهەنشاهی کوردمان بیر ئەخاتەوە، کە ئەویش هەر بەم جۆرە، بەڵام لە شێوەیەکی گەورەترو فراوانترو گرنگتردا گوێی لە زانایانو ڕۆشنبیرانو ڕاستی پەرستانی سەردەمی خۆی ئەگرت، ڕاوێژی ئەوانو ژیریو زرنگیو شارەزایی خۆیشی تێکەڵ ئەکرد توانی بەنگ کێشە نهێن گرەکانی (سوریە)و، گاورە داگیرکەرەکانی ئەوروپاو، سەرۆکە ناپاکەکانی ئیسلام لە ناو بباتو تەفروتوونایشیان بکات!..

### چیرۆکەکە گیانمان شاد ئەکات

بە ڕاستی ئەم چیرۆکە گیانمان زۆر شاد ئەکات. چونکە لە ئەنجامدا چاکیو پاکیو ڕاستیو دادپەروەری سەر ئەکەون. خۆشە زاناو ڕاستی پەرستو بوێژ، زانستو ڕاستی پەرستیو بوێژییەکەی خۆی لە پێناو کەڵکی گشتیدا بەخت بکات. هەروەها خۆشیشە کە کاربەدەستو سەرۆکان، گوێ لەپیاوانی زاناو ڕاستی پەرستو وێژەوانان بگرنو، بەڕاوێژی ئەوانیش بچن بەڕێوە. ئەنجامی ئەمەیش هەروەك لەم چیرۆکەدا دەرئەکەوێ، بەوە ئەگات کە چاکی سەرئەکەوێ بەسەر خراپیداو، دادپەروەری زاڵ ئەبێ بەسەر زۆرداریداو، نیشتمان ڕزگاری ئەبێ لە دەست وێرانیو، نەتەوەیش ڕزگاری ئەبێ لە دەست سەرگەردانی بێجگە لەوە نەتەوەیش بە ئازادییەوە، نیشتمانیش بە ئاوەدانییەوە کامەران ئەبن.

نیازی منیش لە پێشکەش کردنی ئەم چیرۆکە بە خوێندەوارانی کورد پیشاندانی ئەم ئاواتانەیە، کە هیوادارم ئێمەیش بەزوویەکی زوو پێیان بگەین!.

**سەرچاوە:**
**عمر خیام، نوسینی مانویل کومروف، وەرگێڕانی شاکر فەتاح، چاپخانەی کاکەی فەلاح-سلێمانی، ساڵی 1972، ل(3-8) پێشەکییەکە).**



# ڕاکردن لە ناوبانگ

ن. دانالی




پیر کوری‌و مانیا، هەردووکیان لەوەدا سەرکەوتن کە بەڕەنج‌و ماندوبونێکی زۆرەوە لە دەست ناوبانگ خۆیان ڕزگار کرد (مانیا) جاری وا هەبوو خۆی ئەگۆڕیی‌و شێوەی خۆی ئەشاردەوە لە ناسیاوان. تا بتوانێ جارێك، ڕۆژێك لە لادێدا پشوویەك بداو بحەسێتەوە. ئەوە هیچ مرۆڤێ بڕوای بەوە نە ئەکرد کە ئەو ئافرەتە هەرزەکارەی کە کراسێکی ساکاری ژنە جوتیار لەبەر ئەکات هەر ئەو ئافرەتەیە کە لەناو هەموو جیهاندا ناوبانگی دەرکردوەو لەهەموو ئافرەتێکیش بەناوبانگ ترە. هەر ئەو ئافرەتەیە کە پاداشی زانستی (نۆبڵ)ی دراوەتێ!.

کەواتە ئەمە ئاشکرایە کە (مانیا) حەزی لەبینینی ڕۆژنامەگەرەکانیش نە ئەکرد. جارێکیان وا ڕێکەوت کە ڕۆژنامەگەرێکی ئەمریکایی لەدووی دەنگوباسی (مانیا) ئەگەڕا دوایی زانی کە (مانیا) لە گوندێکی پچوکدا خۆی گرتۆتەوە. گوندەکە یەکێك بوو لە گوندی ڕاوکەرەکانی گوێ دەلیای ناوچەی (بریتانی) کابرایش ڕووی کردە ئەو گوندە. پرسی کام ڕێگا ئەڕوات بۆ کۆڵیتی (خێزانی کوری) لەوێدا ئافرەتێکی چاوپێکەوت لەدیمەندا ئاسایی بوو، لە ناودەرگانەی کۆڵیتەکەدا دانیشتبوو، هەردوو پێی ڕووت بوون هیچی لەپێدا نەبوو ئەویش وای زانی ئافرەتەکە کارگێڕی خانوەکەیە. یاخود سەرۆکی کارەکەرەکانە. جا بەم ڕەنگە گفتوگۆیان لەو ناوەندەدا پەیدا بوو:

–تۆی کارگێڕی ئەم خانووە؟

–بەڵێ.

–خانم لەژوورەوەیە؟

–نەء. لەدەرەوەیە.

–تۆ بڵێی بەم زوانە بێتەوە؟

–بڕوا ناکەم.

ڕۆژنامەگەرەکەیش بەتەنیشتیەوە دانیشت لەسەر پلیکانە نزمەکەی خانوەکەو پێی گوت:

(ئەتوانیت لەبابەت ژیانی تایبەتی خانمەوە بابەتێکی ناوازەم پێ بڵێیت) (مانیا)یش وەرامی دایەوە گوتی:

(هیچم لانیە لەو بابەتەوە پێت بڵێم، هەر ئەوەندە هەیە مادام کوری ڕووی لێناوم کە ئەم ئامۆژگاری‌یە گرنگە بە هەموو ڕۆژنامەگەرەکان بڵێم: (ئەوەندە بەتەنگ دەنگوباسی کەسەوە بن، کە زۆری لەڕووی سەر چڵی‌یەوەیە. زۆرتر بەتەنگ بیرو باوەڕەوە بن ).

### لە بەیانی‌یەکی پڕ لەباران دا

لەگەڵ ئەمەیشدا ناوبانگ‌و شاهکاری ڕێزگرتن لە کۆڵیان نەئەبونەوە تا ئەهاتن پەرەیان ئەسەند (پیر کوری) خرایە (کۆمەڵی زانستی)یەوە دوایی هاتە ناو ناوانەوە. هاوڕێکانی کە لە خۆی کەمتر بون. لەزانیاری‌و کار گوزاریی‌دا؛ دانیان پیا نا. لەبەر ئەوە تابڵێی ئەمەیان پێناخۆش بوو چاویان پێهەڵ ئەهێنا. بەڵام بونی (پیر کوری) بە ئەندام لە (کۆمەڵێ زانستی)دا کەڵکێکی هەبو، ڕێگای بۆ کرایەوە کە ببێتە مامۆستا لە زانستکۆی (سوربون)دا. لە ئەنجامی ئەمەدا کارگەیەکی تەواوی کەوتە ژێر دەستەوە کە لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکانی خۆی تیا جێبەجی بکات.. بەم ڕەنگە هیواو ئاواتە دووروودێژەکەی خێزانی کوری هاتە دیی!.

بەڵام لە بەیانی‌یەکی پڕو لە باران دا، لە مانگی گوڵان (نیسان)ی 1906دا پیر کوری لە ماڵ دەرباز بوو. چو بۆ سەردانی ئەو کەسەی کە نوسراوە زانستی‌یەکانی لە چاپ ئەدا.. بەپێ ڕۆیشتە دەرەوە. بەڵام لە پاش چەند کاتێك لە سەر دەست هێنایانە ماڵەوە لەشی وەك لاشەی مردووی لێهاتبوو. ڕێبازەکە باران تەڕولوسی کردبو (پیر کوری)یش پێی لێهەڵ خلیسکابو کەوتبوە سەر زەوی ژێر چەرخی ئۆتۆمبیلێکی گران شتومەك هەڵگر. کە ئەویش کەوتبو بە سەر کەللەی دا شکاندبووی مێشکیشی پژاندبو کەوتبوە سەر تەختی ڕێگاکە!.

ئەمە دوا ڕۆژی مانیا بو کە هەست بە کامەرانی بکات بەڵام وازی لە فرمان کردن نەهێنا. خرایە جێگای مێردەکەی خۆی‌و کرا بە مامۆستا لە زانستگۆی سوربون دا. ئەمە یەکەم جار بو لە

مێژووی زانستگۆی فەرەنسەدا کە ڕێ بەژنێك درابیو ماموۆستایی بکات!.

لەوە پێش پیری مێردی فرمانی تیا ئەبینی دەستی کردووە بە لێکۆڵینەوەکانی خۆی. ئێستاکە خۆی بوە بەکارگێڕی کارگەکە.. بێجگە لەوە ئەبو خەمی پەروەردەکردنی هەردوو کچەکەیشی بخوات. هەروەها ئەبو وتارانی زانستیو بڕیارەکانی خۆیشی ئامادە بکات لە بابەت ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیەوە..

**نامەی شیوەن**

ئەبو شتێکی تریش بکات: ئەبو هەموو شەوێك پێش نوستن لە شوێنێکا بمێنێتەوە؛ تا بیرەوەری ئەو ڕۆژەو کارەساتەکانی لە شێوەی نامەدا تۆمار بکات بۆ مێردە جوانەمەرگەکەی، هەر وەك مێردەکەی مابێ لە ژیانداو ئەویش نامەی بۆ بنوسێ وابو:

(ئەی پیری خۆشەویستم! پێیان گوتم بچمە سەر تەختی دانیشتنەکەتو لە زانستکۆدا.. منیش پێم پەسەند بو..

بەڵام نازانم لە وەدا چاکم کردوە یان خراپ؟).

(پیری خۆشەویستم! من هەموو دەم تۆم لە بیردایە. بیرت لێئەکەمەوە.. سەرم گەرم بوە، ئەوەندەی نەماوە بتەقێ.. هۆشم لێتێك چوە، ئەوەندەی نەماوە شێت ببم.. هەرچەند ئەکەم ناتوانم ئەوە تێبگەم یاخود باوەڕی پێ بکەم، کە ئەتوانم بەبێ تۆ بژیم..).

(ئەی پیرە پچکۆلەکەم!. درەختی (لابرنم)ەکە گوڵی کردوە.. بەڵام (سوسەن)و، وەستاریاو، لاولاو)ەکان تازە خەریکن ئەپشکوێن.. تۆیش دڵت بە وانە؛ بە هەموو یان دائەچوو..).

(وام لێهاتووە ئیتر حەز لە ڕۆژو لە گوڵ ناکەم تەنانەت کە ئەیانبینم دڵتەنگ ئەبم.. وام لێهاتوە هەرچەند ئاسمان ئەبێتە تەمو مژو هەورە تریشقە، زۆرتر هەست بە سرەوت ئەکەم چونکە ڕۆژی مردنی تۆ وابو، جا ئەگەر هێشتا وام لێنەهاتبێ کە قینم لە ئاسمانی پاكو بێگەردو خۆشیانی هەڵ بستێ، هەر لە بەر ئەوەیە کە منداڵەکانم پێویستییان بەوانە هەیە).



(مادام کوری)، لەپێناو مرۆڤایەتیداو لەبەر کەڵكو چاکەی منداڵەکانی دەستی کردووە بە فرمان کردن لە بەر گەلێك ئەرکو ئازاردا خۆی ڕائەگرت ئەویش لە پێناو سوك کردنی ئازاری مرۆڤایەتیدا. کاتێ کە بۆ جاری دووەم پاداشی (نۆبل)ی درایە، لە ساڵی **1911**دا؛ هەر لەبەر ئەوە وەری گرت، کە ئەوەیشی بە هەلێکی تر دانا کە یارمەتی بداتو ماوەی لێکۆڵینەوەکانی تا خۆی فراوانتر لێبکات. کوری لێکۆڵینەوەی ئەمجارەی (کاریگەری رادیۆم بو لەیارمەتیدانی برینەکاندا کە زووتر ساڕێژ بن)!.

**فریشتەی دڵ پێ سووتان**

کاتێ کە ئاگری جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی **1914**دا هەڵگیرسا، گەلێك ئۆتۆمبێلی ئامادە کردو کەلوپەلی چاك کردنەوەی نەخۆشەکانی تێخست، کە

برینەکانیان بە هۆی تیشکی ڕادیۆمەوە چاك بکاتەوە. خۆی بە سەر ئەو ئۆتۆمبیلانەوە بو، ئەگەرا بە ناو هەموو کوری جەنگەکاندا، لە هەموو خاکی فەرەنسەدا، سەرپەرشتی ئەو کارانەی ئەکرد هەر وەك فریشتەی بەزەیی پیاهاتنەوەو دڵ پێ سوتان بووبێ وابو، فەری چاك کردنەوەی نەخۆشی ئەبرد بۆ برینداره‌کان هەرچی خەمو خەفەتو ئازاری دڵی خۆیشی هەبو، لەو دیو ڕووە جوانە زەرد هەڵگەڕاوەکەی خۆیو، زەردەخەنە هان دەرەکانیو، گفتگۆ نەرمو شیرینەکانیو دەسوپەنجە ناسکەکانیەوە ئەشاردەوە کە دەرمان سوتاندبونی!..

کە برینداره سەرسامەکان ئەو مەکینەی تیشکی ڕادیۆمە گەورەیەیان ئەدی؛ لێیان ئەپرسی: (ئاخۆ ئازارمان ئەدات؟..) (مادام کوری) بە دڵنیاییەکەوە وەرامی ئەداتەوە ئەیگوت: دیارە ئازارتان ئەدات.. بەڵام هەر ئەوەندەی پێ ئەچێ کە وێنەیەکتان بگرم!..

جەنگ بڕایەوە.. (مادام کوری) دەستی کردووە بە هاتوچۆکانی خۆی؛ وتار بدات ئەچوە هەر جێگایەك ئاهەنگیان بۆ ئەگێڕاو، نیشانیان ئەدایەو. گفتگۆی ڕۆژنامەیی لەگەڵدا ئەکراو؛ خوانی بۆ ئەڕازانرایەوە کە لەسەروو هەموانەوە دابنیشێ.. بەڵام ئەو تازە دڵی سارد بوبوەوە؛ گیانی دامرکابوەوە، هەموو دەمێکیش خۆی لە سامانداریی و نازو جیازی دەوڵەمەندانە ئەپاراست!.. یان هەر وەك خۆی ئەیگوت:

(ئەوانەی خەواڵوون؛ هەڵناگرن سامانیان ببێ، چونکە خۆیان ئارەزووی ناکەن!.).

**دوایی ڕێگاکەی**

(مادام کوری) خەوەکەی، دوایی هات. ئەویش ڕۆژێك بو لە ڕۆژانی ساڵی 1934.. ئەو ڕۆژە کە لە کارگەکەی گەڕایەوە هەستی بە خۆی کرد تەواو ماندوو بوە، تەواو برسێتی بڕاوە بۆ بەیانی دوایی، هەرچەندی ئەکرد نەی ئەتوانی لە پێخەفەکەی ڕاست ببێتەوە، پزیشکەکانیش هەرچەندێکیان کردو کۆشان نەخۆشییەکەی ئەویان بۆ دەرنەکەوت!. بە نیشانەکانیا وا دەرئەکەوت کە لە نەخۆشییەکانی پژمەی بزن (ئەنفلوانزە)و سییلو خوێن کزیی بکات، بەڵام نەخۆشییەکەی ئەو لەو سێ نەخۆشیانە، هیچ کامێکیان نەبو!.. ڕاستییەکەی ئەوە بو، نەخۆشییەکەی نەزانرا چییە، تا پاش مردنی. (مادام کوری) ژەهری تیشکی ڕادیۆم کاری لە هەموو ئەندامە گرنگەکانی لەشی کردبو، بەرە بەرە ڕزاندبونی. تا بە یەجگاریی مردبو!.

بەم ڕەنگە (مادام کوری) لە پێناو نامە گەورەکەی خۆیدا یاریدەدانی مرۆڤایەتیو لابردنی ئازاری نەخۆشانو چاکە پەروەریی خۆی بە کوشت دا..

(مادام کوری) هەر وەك مۆمێك وابو، لایەکی تاریکایی جیهانی ڕووناك کردەوە.. بەڵام ئەوەیش زۆر گران کەوتە سەر مرۆڤایەتی چونکە خۆی سووتا!..

**سەرچاوە:**

**مادام کوری، نووسینی: دانالی، وەرگێڕانی شاکر فەتاح، چاپخانەی ژین-سلێمانی، 1968، ل( 30-36).**



# پێکەنین پرشنگ دەدا لە ژین

(1)

پێشەکی

(گاڵتەو گەپ) و (قسەی نەستەق) و (ناسکە قسە) و (ووتاری خۆش) و (دەنگ و باسی گەورە پیاوان و ڕۆشنبیران) و (مەتەڵ) و (هۆنراوەی بە جۆش) و (پەندی پێشینیان) لە باریاندا هەیە مرۆڤ دڵخۆش بکەن و بیشیهێننە پێکەنین. پێکەنینیش لە باریدا هەیە پرشنگ بدات لە ژین و، لەش و هۆش و دڵ و دەروون و گیان ببووژێنێتەوەو، هێزو تینیان پێ بدات و، ئاراستەی‌شیان بکات بۆ ژیانێکی چاکتر و پاکتر و باڵندتر.

کەواتە (پێکەنین) پێویستی‌یەکی (ژین)ە. چونکە بەختیاری دەخاتە ناوماڵەوە. زیندەگانی دەخاتە ناو فرمانەوە. ئازار و هاواری ژین لە کوڵ پیاو دەکاتەوە. لە ماندووبوون ڕزگارمان دەکات. لە دوژمنایەتی دوورمان دەخاتەوە. ترس و لەرز لە دڵمان دەکاتە دەرەوە. لە سەدان تەنگ و چەڵەمەیش دەربازمان دەکات.

کەواتە ئەگەر ژینێکی پڕ تەندروستی و سەرکەوتن و بەختیاریمان دەوێ: ((بام پێبکەنین)).

(2)

منداڵی ساوای بێ گوناه، پێدەکەنێ ...

لاوی بەگوڕو هەڕەت، پێدەکەنێ ...

پیاوی نەژاد و سەروەر و کارگوزار، مرۆڤی سەرکەوتوو و سەرفراز هەر پێدەکەنێ ...

گوڵیش بە دەم کزەبا فێنکەکەی بەیانیانەوە هەر پێدەکەنێ ... یاری شەنگ و شۆخیش بە دەم مێردی پاشەڕۆژیەوە، هەر پێکەنێ.. دۆستی ڕاستەقینەیش بۆ دۆستی خۆی، باوك و دایکیش بۆ جگەرگۆشەی خۆیان، مامۆستایانیش بۆ شاگردە زیرەك و ئازاکانیان هەر پێ دەکەنن..

کەواتە (پێکەنین): هێزێکە..

پیاویش هان دەداتە سەر کاروفرمان و، خۆشیی ژیان و، پێکەوەنانی دەسەڵاتداریی و سەرکەوتن..

سەرچاوەیەکی خودایی‌یە: لەش و دڵ و دەروون و گیان دەبووژێنێتەوە.

کەواتە بام پێبکەنین..



# پێ کە نین پرشنگ دە دات لە ژین

لە دوو توێی ئەم بەرگەدا هەڵبژاردەیەك لە پێکەنینی [ کوردەواری ] و [ جیهانی ]ت پێشکەش دەکرێ بە هیوای ئەوەی خۆشی و شادمانی بە ژینت ببەخشرێ .

نووسین و کۆکردنەوەی :

شاکر فتاح

زنجیرەی ژمارە : ( ٨١ ) . سالی ١٩٨٦ . چاپخانەی (ئەسعەد) . (بەغداد) . نرخی بە (٦٠٠) فلسە

(3)

پێبکەنە..

تا دەتوانیت: پێبکەنە...

قاه قاه: پێبکەنە...

تا دەکەویت بەسەر گازی پشتتدا: هەر پێبکەنە!.

تا لە پێکەنیندا بڕستت دەبڕێ: هەر پێبکەنە!..

چونکە خەمو خەفەت چارەی گیرو گرفت و تەنگ و چەڵەمەو ئەرك و ئازارەکانتی پێ ناکرێ!..

کەواتە پێبکەنە!.. با پەشێمان نەبیتەوە لەوەی تەمەنت بە دڵتەنگی و خەم و خەفەتەوە ڕابووراردووە..

پێبکەنە: لە خۆشیتدا..

پێبکەنە: لە ناخۆشیتدا..

پێبکەنە: بە دەم سەرکەوتن و پەك کەوتنەوە..

پێبکەنە: لە جوانی و پیرێتیدا..

پێبکەنە: لە دەوڵەمەندی و هەژاریتدا..

پێبکەنە: لە تەندروستی و نەخۆشیتدا..

پێبکەنە: لە ژین و دەمەو مردنتدا..

کەواتە: هەر پێبکەنە ..

(4)

پێبکەنە: بام سوپای خەفەت و ئازار بشکێنی..

بام دوژمنی بەدکار بمرێنی..

بام بەسەر گیروگرفتی ژینتدا زاڵ بی ..

بام هەمموودەم بە دەستەبراو هەڤاڵ بی..

بام لە کاروفرمانتدا بەکاربی..

بۆ هەموو کەس بە فەڕو بێئازار بی..

پێبکەنە: بام لەش و هۆش و دڵت، خۆش و بە هێزبن.. تا بتوانیت بەرەنگاریی (زۆرداری) و (هەژاری) و (نەخوێندەواری) و (نەخۆشی) بکەیت لەناو گەلەکەتدا...

تـا بتوانيـت بگـەيت بـە ئامـانجی بـەرزی خـۆت و نەتـەوە و نيشتمانت ..

تا بتوانيت بە (ئازادی) و (شادمانی)يەوە بژيت...

(5)

ئەو کەسە هەڵە دەکات کە بە دەم گيروگرفت و دەردو ئازارەوە پـێ ناکـەنێ!؟.. چونکـە (پێکـەنين) هێزێکـە چارەسـەری هــەموو گيروگرفت و تەنگ و چەڵەمەيەك دەکات!..

ئـەو (ژيـن)ەی هەمانـە زۆرتـر بـە نـرخ دەبـێ، ئەگــەر بـە دەم (پێکـەنين)ەوە بـەکارو فرمـان و تێکۆشـانی مەردانــەوە بەسـەری ببـەين، بۆ (کـەڵکی گشتلايی).. نـەك بە شين و شـەپۆڕو گريـان و کردەوەی خۆپەرستانەوە..

لەبەر ئەوە پێويستە: لـە هـەموو بارێکدا، لـە هـەموو جارێکدا، (کۆششی مەردانە)و، دەم و چاوی (گوڵخەندەرانە)مان ببێ..

واتا: هەر بە کەڵك بين و پێکەنين تا ژينی وا خۆش و نايابمان دەست بکەوێ!.

***

منيـش ئـەی خوێنــدەواری خۆشەويسـت! بـەم نيـازەوە ئـەم نووسراوەم پێشکەش کردووە. لـە خـودام دەوێ: پرشنگ بدات لـە ژينـت وە، خۆشـی و شـادمانيت پـێ بگەيـەنێت، هــەروەها ئاڕاستەيشت بکات بۆ ئەوەی (کەڵك) و (شادمانی) بە نەتەوەکەی خۆت بگەيێنيت.

سەرچاوە:

پێکەنين پرشنگ دەدات لەژين، نوسينی شاکر فـەتاح، چـاپی يەکـەم سلێمانی، چاپخانەی سەرکەوتن، ساڵی 1970، پێشەکی‌يەکەی.



# شەهیدی بیروڕا دەبڕین

فەلەکەدین کاکەیی

(شاکر فەتاح)ی مرۆڤ و نووسەری کورد، لە ژیانی تایبەتی خۆی و لە ژیانی ئەدەبی‌دا، هەر بەدوای بنچینەو بنەماکانی ژیاری و مرۆڤایەتی‌دا دەگەڕا، لە هەر نووسینێکی‌دا جۆرە بنەماییێکی رەوشتی کۆمەڵایەتی دەگەڕا بابزانین چۆن لە نامیلکەو نووسینەکاندا لەو بنەمایانەوە دواوەو هەڵوێستی بەرامبەریان چۆن بووە؟ بە چ جۆرێك لەبەرهەمەکانی‌دا بەکاری هێناون؟

بۆ نموونە لە پێشەکی کتێبەکەی (ئیلیادە و ئۆدێسە)ی هۆمێرۆسدا نووسیوە و دەڵێ: (بەڵێ وایە!.. لەئەنجامدا هەر (ڕاستی)و (دروستی)و (دادپەروەری)و (پاکی) سەردەکەون و (نالەباری)و (زۆرداری)و (ناپاکی) ژێر دەکەون..!).

نووسەری شەهید ئەمەی لە نیسانی 1967دا نووسیوە. هەروەها لە زۆربەی پێشەکی‌یەکانی بۆ کتێبە وەرگێڕاوەکانی بەو جۆرە بەها مرۆیی‌یە گشتی‌یەکانی ستایش کردووەو وەبیر (خوێندەوارانی کورد)ی هێناونەتەوە.. لە پێشەکی وەرگێڕانی کتێبی (ریشیلیۆ)ی کاربەدەستی هەرە گەورەی فەرەنسە، کە بە (کاردینالی خوێنڕێژ) ناو دەبرا، شاکر فەتاح پاش پێداچوونەوەیەکی کورت دەنووسێت: (.. ئەمانە هەموو، چاکترین بەڵگەن بۆ ئەوەی کە (ریشیلیۆ)ی پیاوێکی بلیمەت و ژیرو تێگەیشتوو و هونەرمەندو نیشتمان پەروەرو چاکەخوازو کارگوزار بووەو، خۆیشی لە پێناو (ئازادی)و (کامەرانی)ی نەتەوەکەی خۆی‌دا بەخت کردووە..).

ئەمجا نووسەری شەهید دەنوسێ کە: نیشتمانی ئێمەش شایستەی ئەوەیە ئەم نووسراوە پێشکەشی خوێندەوارە بەڕێزەکانی بکەم، بۆ ئەوەی کەڵك و خۆشی لێوەربگرن..) ئەمەیشی لە کانوونی دووەمی 1966دا نووسیوە. لەم پێشەکی‌یەی‌دا دەبینین مامۆستای شەهید وشەی (ئازادی)و (کامەرانی)ی خستۆتە ناو دوو کەوانەوە، هەروەها وشەی (نووسراو) کە ناونیشانی پێشەکی‌یەکانیەتی، کاتێك کەلێی ورد دەبینەوە، دەبینین لە دووتوێی ئەو (نووسراوە)دا پەندو ئامۆژگاری‌یەکی نیشتمان پەروەرانەی روون و رەوانمان پێشکەش دەکات، چونکە بە خوێندەوارانی کورد دەڵێت: کەڵك و خۆشی لەم (نووسراوە)و لە ژیان و فیداکاریی (ریشیلیۆ) وەربگرن، کە لە پێناوی (ئازادی)و (کامەرانی)دا خۆی بەخت کردووە.

ئایا مامۆستا شاکر فەتاح لێرەو لە چەند جێگەیەکی دیکەدا، ڕاست و دروست باسی چارەنووسی خۆی نەکردووە؟ ئایا دەتوانین لەم بۆچوونەدا یەکێك لە کلیلەکانی شەخسیەتی (شاکر فەتاح)ی شەهید بدۆزینەوە؟ چونکە چارەنووسی بەو شێوە سەرفرازی‌یە، وامان لێدەکات یەك بە



نووسینەکانی‌دا بچینەوە.

نووسەرانی مەزن، جاری وا دەبێ، کە ژیانیان دەکەوێتە ژێر تیشکی بەرهەمەکانیان، جاری واش هەیە بەرهەمەکانیان لە بەر تیشکی شێوەی تایبەتی ژیانیان و چارەنووسیان دەکەونە بەر شیکردنەوە، هەرچەندە لە ئەنجامدا، ژیان و بەرهەمی نووسەر لەیەك جودا نابنەوە.

مامۆستای شەهید، لە گشت بەرهەمەکانی‌دا، بایەخێکی گرنگی‌بەبەها مرۆیی‌یە گشتی‌یەکان داوە، لە نووسراوەکانی یا پێشەکی‌یەکانی و وتارە تایبەتی‌یەکانی‌دا ناوی هێناون، وەك (ڕاستی) و (دروستی) و (دادپەروەری)، (پاکی)، (ئازادی)، (کامەرانی)، (ڕەوشت و خووی جوان)، (کرداری بڵند)، (سەربەستی)، (یەکسانی)، (برایەتی)، (دیموکراتی)، (خۆشەویستی)، (چاکی و چاکەخوازی).

ئەمانە چەندین بەهای گشتیی مرۆیی پەسەند لە گشت بەرهەمەکانی شەهیددا دەبینرێن.

لە مێژووی ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی‌ی هەر نەتەوەیەکدا کەسانێك پەیدا دەبن، چ بە نووسین، یا بە پەندو ئامۆژگاریی، ئەو بەهاو چاکە گشتی‌یانە دەپارێزن و، خەڵکی بۆ ڕێنمایی و پابەندبوون بەوانەوە ڕادەهێنن، لە مەش گرنگتر ئەوەیە، کە کەسانێکی وا پەیدا دەبن، هەر چەندە کە من، کە لە پێناو بەرجەستەکردن و پاراستنی ئەو بەها گشتی‌یانەدا، گیانی خۆیان بەخت دەکەن، واتە: بەهادارترین بەهای وجودیان کە خودی ژیان و مانەوەیانە دەکەنە فیدای بیروباوەڕیان، هەر بۆیەشە کە دەڵێم: شاکر فەتای شەهید، بەلای منەوە، یەکێکە لەو شەخسیەتە مێژوویی‌یانەی نەتەوەی کورد.

ڕەنگە کەسانێك پەیدا بن و بڵێن: کە (عەرەب گوتەنی) ئەو هیچی نەکردووە، تەنیا (تەسجیل مەوقف) نەبێت. بەلام ئایا چارەنووسێکی وا سەرەرزانەو، بەو جۆرە تراژیدی‌یایە، دەتوانرێ بە ئاسانی تەنیا بە (تەسجیل مەوقف) تەفسیر بکرێ و هیچی‌تر؟!.

یەکێك (هەڵوێست) تۆمار دەکات، تا لە قۆناغی دیکەی ژیانی بەرهەمەکەی وەدەس کەوێ، واتە: بمێنێ و بەرامبەر بەو هەڵوێستەی پلەو پایەیەکی پێ بدرێ، یا بە تەنیا ڕێز لە ناو خەڵکی‌دا، کە ئەو ڕێزگرتنەشی بەرهەمێکی چاکە، بەلام وەختێك نرخی واقیعی خۆی دەبێ کە لە وجودی ژیانی شەخسەکەدا بە دەستیی هاتبێ. ئەی ئەوەی کە نە حزبێکی هەبوو، تا جەماوەرەکەی لە فیداکاریی ئەو قاعیدە بەرفراوان بکات!! نە لەو هزرو خەیاڵەدا بووە تا کەسێك لە بەروبوومی قوربانی‌دانی کەڵك وەربگرێ!! نە خۆشی ما تا بەچاوی خۆی ببینی چۆن ڕێزی لێ دەگیرێ؟ بەڵکو هێمن و خۆڕاگرتووانە بڕیار دەدا ببێتە (قوربانی) بۆ بەهایەکی هەرە بەرز، بەهای ئازادی بیروڕا دەربڕین ئەو بیروڕایەش بۆ چارسەری کێشەی گەلەکەی، لە ڕۆژێکی هەرە

سەخت و دژواری ژیانی ئەو گەلەدا!!.. ئەی ئەمەی گەر تەنیا بەهاندانی هێزێکی قووڵی دەروونی و وەلامدانەوەی پرسیارێکی‌نیشتمانی، مرۆیی خۆشەویستی و پابەندبوون بە بەها گشتی‌یەکانەوە نەبێت، بە چ واتایەکی دیکە وەلام دەدرێتەوە؟!

ئا بەو پرسیارانەو، بەو شێوە بۆچوونەوانەوە هەوڵ دەدەم لە حەقیقەتی بڕیاری بەرەو شەهادەت چوونی شاکر فەتاح نزیك ببمەوە. بۆیە بەلای منەوە ئەو بڕیاری دابوو بەو شێوەیە شەهید ببێ.

گەورەیی و مەزنی و جاویدانی ئەویش هەر لەوەدایە کە بە هۆشیاریی تەواوی خۆی، ئەو بڕیارەی داوە.. بڕیاری زاتی خۆیەتی، نە لەسەر داوای کەسێك ، یا حزب و کۆڕو کۆمەڵێکی سیاسی یا کۆمەلایەتی بوەو نە لە ژێر گوشارێکی کتوپڕ، یا لە ناچاری بوە، وەکو ئەوەی یەکێ: لە پێناوی بیروڕایەك دەسگیر ببێ و ئەشکەنجە بدرێ و بکەوێتە بەر دوو ئەنجام:.

یا مل کەچ کردن بۆ زۆر دارو دەس هەڵگرتن لەو بیروڕایەی یا شەهید بوون!! ئەو لە هیچ کات لەو مەوقیفانە نەبووە، بەڵکو لە تەمەنێکیشدا بووە کە کەس گلەیی و گازندەی ئەوەی لێ نەکات، گەر ئەو هەڵوێستەی نەبوویایە! جگە لەوەش، مرۆ لە پیری‌دا زیاتر دڵی بە ژیان خۆش دەبێ لە چاو سەردەمی جوانی و پتر هەوڵی مانەوە دەدات.

حەقیقەتێکی دیکەش: جگە لەوەی کە لە سەردەمی خۆی‌دا لە سالانی **1988** و **1989**دا لە مەڕ گرتن و شەهیدبوونی دەمان بیست، هەروەها پاش ڕاپەڕین و چەندین پرسیارو لێکۆڵینەوە لەگەڵ برادەرانی ئاگادار لەم مەسەلەیەدا ئەوەمان تا ڕادەیەك بۆ ڕوون بووەوە:

یەکەم: شاکر فتاح، تەنانەت پاش وتارەکەی، چەندین ڕۆژ ماوەی خۆشاردنەوەو هەلاتنی لە دەست دامودەزگای ڕژێم لەبەردەمدا بووە.

دووەم: ماوەیەکیش خەریك بوون ڕازی بکەن بە پاشگەز بوونەوە لە دەربڕینەکانی بەرامبەر بەوەی کە دەستی لێ‌نەدەن.

بەلام ئەو لەو ماوەیەدا، نە هەوڵی خۆشاردنەوەو هەلاتنی داوەو، نە تۆزقالێکیش ئامادەیی پاشگەزبوونەوەی پیشان داوە، تەنانەت هەوڵیشی نەداوە پەیوەندیی بە حزب و هێزە کوردستانی‌یە نیشتمان پەروەرەکانی چیاوە بکات، بۆ چارەسەری کێشەکەی، یا پاراستنی بە هەر شێوەیەك.

هەر لە بەر ئەوەش دەڵێین: کە مامۆستا شاکر فەتاح بڕیاری دابوو بەو شێوەیە شەهید ببێ، چونکە ئەگەر وتارەکەی قسەیەکی کتوپڕیی لەحزەیەکی دژواری‌نا ئاسا بوایە، یا لە تووڕەبوون و لەحزەیەکی بێزاری‌دا بیگوتایە، ڕەنگ بوو پاش یەك دوو ڕۆژ، ئەگەر یەك دوو سەعات نەبێ پەشیمان بووبایەوە، یان بە هەر شێوەیەك موساوەمەی بکردایە.

ئەو هیچ لەوانەی دەرنەبڕی، لەسەر بڕیاری خۆی مایەوە، تاك و تەنیا بەرامبەر بە دەزگای دۆزەخینی ڕژێمێکی خوێنڕێژی وا وەستا کە تۆزقاڵێك بەزەیی بە کەسدا نە هاتووە لە وانەی بەرهەڵستی‌یان دەربڕیوە، تەنانەت ئەوانەش کە سەردەمێك کە بنیات نەرو سەرکردەکانی خۆیان بوون یا ئەوانەی تەنیا بە گومان بونی بەرهەڵستکاری‌یان لێ‌کردووە ڕزگاریان نەبوە.

کێ دەتوانێ بڵێ کە (شاکر فەتاح) لەوە، هەمووی ئاگادار نەبووە؟ ئەوە کە لە (ساڵانی **1940**)ەوە بە تایبەتی ڕۆژنامەی دیواریی خۆی لە خۆی لە خورماڵەوە بیگرە تا ئاکرێ‌ی هەبووە، جگە لە نووسینی وتاری جۆراو جۆری لە گۆڤاری گەلاوێژدا لە بارەی بارودۆخی جیهانی ئەو سەردەمە. کە ئەمەش نیشانەی ئاگاداریی و هۆشیاریی‌یەتی بەرامبەر بە هەلومەرجی ناخۆشیی.

من ئەو بۆچوونەم بە بناغەی دیدم بەرامبەر بە شەهید بوونی مامۆستا شاکر داناوە، هەر چەند زەحمەتە بەئاسانی لە هۆی ڕاستەقینەو دەروونی‌ی بڕیاری مرۆیەك تێ‌بگەین کە لە نێوماندا نەماوە، چونکە -بەگشتی- ژیان و هزرو خەیاڵ و چارەنووسی ئینسان، هەر ئینسانێك، زۆر لەوە پێچیدەترو شارەوەترە کە بتوانین بە پێوەرێك یا بە خەتکێشێك بیپێوین و وەڵامی نیهایی ڕازو نهێنی‌یەکانی بدەینەوە. لە ژیانی هەر ئینسانێکدا، هەزاران ڕازو نهێنی شاراوە، تەنانەت شاراوە لە خۆشی، دەمێنێتەوە. هەر



بۆیەش بە ناچاری دەبێ پەنا ببەینە بەر زانیاری‌یەکانمان لە ڕواڵەتی ژیانی و بەرهەم و ڕەفتارو کردەوە ناسراوەکانی ئەمڕۆ.

لە مەڕ شەهید شاکر فەتاحەوە. کتێب و نوسراوەکانی یەکێکن لە زانیاریە ئەساسی‌یەکانی ناسینی شەخسیەت و ژیانی ئەو، بەڵکو بە بڕوای من، هەندێ ڕیشەی دوا هەڵوێستی ژیانی ئەو، لە بەرهەمەکانی ئاو دەخۆنەوە. واتە: شاکر فەتاح لە زمانی خودی شاکر فەتاحەوە بناسین.

وەختێك خواڵێخۆش بوو علاءالدین سەجادی کۆچی دوایی کرد دەزگای ڕاگەیاندن، لە ناوچەیەکی ڕزگارکراوی ئەم پارێزگایەی هەولێردا بوو، چەندین جار باسی کۆچکردنی علاءالدین سەجادی‌و ئەو خزمەتە گەورەیەی بە گەنجینەی ڕۆشنبیری کوردی کردو، لە بەرنامەکانی ئێزگەکەماندا گرنگی پێ‌درا.

برادەرێك لەو دەمەدا گوتی: بۆچی ئەوەندە باسی مامۆستا علاءالدین سەجادی دەکەن، لە کاتێکدا لە فلانە ساڵ چووە پاڵ ڕژێم.. (چەند قسەیەك لەم بابەتە).

لە وەڵامدا گوتمان: هەرچی بووبێت، مامۆستا علاءالدین سەجادی شەخسیەتێکی بەرزی ڕێنیسانس (بووژانەوەی)ی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی کوردە، بەرهەمە شاکارەکانی وەك مێژووی ئەدەبی کوردی و ڕشتەی مرواری و گەشتێك بەکوردستان و بەرهەمی دیکەی لە سەردەمی حزبی بەعس و ڕژێمەکەی‌دا داهێناوە، ئەوانە گەنجینەی کەلەپووری کوردین. جا ئێمە بۆچی علاءالدین سەجادی و بەرهەمەکانی بە ڕژێم بدەین؟ بۆچی وا بکەین ڕژێم بیقۆزێتەوە؟ ڕژێمی دژ بە کورد بە خۆی کارێکی وای کردووە، تا ڕۆژێك لە ڕۆژان هەموو ئەوە بزانین، واتە: خزمەتی ڕۆشنبیریی‌یان بە بەشێك لە مێژووی ڕژێم بزانین و.. بەو شێوەیە هیچ بۆ کورد نامێنێتەوە. نەخێر ئەو نووسەرانە بە چاکی خزمەتی نەتەوەکەی خۆیان کردووە، یەکێك لەوانەش خزمەتی پڕ لەشانازی مامۆستا علاءالدین سەجادی‌یەو خۆی و بەرهەمەکانی موڵکی کوردو کوردستان و هی خۆمانن و بەهی خۆمان دەمێننەوەو، مایەی شانازیی مێژوویی خۆمانن، بۆچی بیان دەین بە دوژمن؟!

وەڵامی دیکەش لەو بابەتەوە، لە بارەی شەهید شاکر فەتاحەو زۆر دروست و چەسپاوە، نەك لە ڕووی سۆزو عاتیفەی نیشتمانی‌یەوە بەرامبەر بە چارەنووسە تراژیدی‌یەکەی، بەڵکو بە هەق و حەقیقەت، شاکر فەتاح وەك علاءالدین سەجادی وەك پیرەمێرد و مام هەژار، یەکێکە لەو کۆڵەکە پتەوانەی مێژووی سەرهەڵدان و بووژانەوەی کورد. ئەمانە مانیفیستی سیاسی‌یان نەنووسیوە. بەڵام زەمینەی جووڵانەوەی سیاسی‌ی کوردیان دارشتوە.

لێرەدا وەختی لێکۆڵینەوە لە بەرهەمەکانی نییە، ماوە کەمە، بێگومان ئەوە هەڵدەگرێ لە فورسەتێکی دیکەدا وەك (کاك مەحمود زامدار)و چەند برادەرێکی دیکە، ماوەیەکە داوا دەکەن سیمینارێك بۆ (شاکر فەتاح)ی نەمرو بەرهەمەکانی ببەسترێت، ڕەنگە باش بێ بە هاوکاری، یا لە ژێر چاودێری وەزارەتی ڕۆشنبیریی، یا دەزگایەکی دیکەی ڕۆشنبیریی وەك یەکێتیی نووسەران، سیمینارێکی وا لە یادی شەهید بوونی ببەسترێت.

ئەوەی لێرەدا مەبەستە، دوور لە عاتیفە بەرامبەر بە چارەنووسی، خزمەتێکی شیاوی ئەدەبی کوردی کردووە لە چەند بوارێکی دیاردا، کە لە هەندێکیاندا ڕچەشکێن و پێشەنگە.

زۆر بە کورتی، بەرهەمەکانی، بەلای منەوە، لەم بوارانەدا سوود بەخش بوون:.

یەکەم: لە نووسین و خوێندنەوە بە زمانی کوردی و دەوڵەمەندکردنی پەخشانی کوردی، مامۆستا شاکر فەتاح، خاوەن پەخشانێکی ڕەوان و سادەو بە تام و چێژەو بە شێوە زمانێکی ڕەسەنی کوردی دای دەڕشت.

ئەم بوارەش لێکۆڵینەوەی دوورودرێژ هەڵدەگرێ، کە لێرەدا ماوەی نیە. بەڵام خوێندنەوە بە کوردی و نووسین بە زمانی زگماکی کوردی، یەکێك بووە لە ئامانجە گرنگەکانی سەرەتای ژیانی نووسەریی ئەم ئەدیبە دڵسۆزەمان.

دووەم: ڕۆژنامەنووسی: جگە لە ڕۆڵی شاکر فەتاح لە نووسینی وتاری بەکەڵك لە گۆڤاری گەلاوێژو گۆڤاری کوردییەکانی دیکەدا، بەخۆی لە هەر کوێ قایمقام بایا بەڕێوەبەری شارەوانی بوایە ڕۆژنامەی هەفتانەی دیواریی دەرکردووە وەك کۆمەڵە ڕۆژنامەی (خورماڵ)، (چەمچەماڵ)، (باسەڕە) لە قادر کەرەم و، ڕۆژنامەی ناوچەیین واتە: (شارو شارۆچکە)، تام و چێژی ڕۆژنامەیان پێوەیە، بایەخی بە هەواڵ و باری ژیانی ئەو شارە دەدا، جگە لەوەش لە هەندێ ڕۆژنامەی وەك (خورماڵ) لە ساڵی **1940**دا باسی دەنگوباسی جەنگی دووەمی جیهانی کردوە.

تێگەیشتن لە ڕۆژنامە لەلای شاکر فەتاح، بەخۆی بابەتێکەو لێکۆڵینەوە هەڵدەگرێ، چونکە ڕۆژنامە لەلای ئەو نووسەرە نەمرە هۆیەکە بۆ پێگەیاندن. هەر بۆیەش لە یەکەمین ژمارەی خورماڵ لە **1940/6/3**دا نووسیویەتی: (بە ناوی خەودای گەورەو تواناوە، ئەم ڕۆژنامە پێشەوایە)، لە ژمارەیەکی ڕۆژنامەی (چەمچەماڵ لە **1946/7/1**دا دەڵێ: (بە یارمەتی خواو کۆششی خۆتانەوە، ئەم ڕۆژنامەیەش کە ناومان ناوە (چەمچەماڵ) ببێتە پێشەواو ڕێ پێنیشاندەرتان بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن لە ژیانتانا) ناویشی لێ ناوە (ڕۆشن کەرەوەی شەقامی ژین).

لە ژمارەیەکی ڕۆژنامەی (باسەڕە)شدا کە لە قادر کەرەم دەرچووە لەڕۆژی **1942/6/25**دا نووسیویەتی (بۆ ڕۆشن کردنەوەی شەقامی ژینتان، بۆ ڕاست کردنەوەی ڕەوشت و خووتان، بۆ بەهێزکردنی ئایینتان بە (خودا)و بە (ڕاستی) بۆ ڕزگارکردنتان لە دەست نەزانیی و، دەردو، خەفەتباریی و هەژاریی و، ستەم و زۆرداری، بۆ ئەوەی چێژکەی سەربەستی بکەن و.. ئەم ڕۆژنامەیەمان بۆ ئێوە هێنایە بەرهەم).

لەوەش زیاتر بە خوێنەرانی دەڵێ: سەربەست بنووسن و، لە هەمان سەروتاردا هاتووەو، لەگەڵ خوێندەواراندا دەدوێ و دەڵێ:.

(بێجگە لەوە، هەر کامێکتان ئارەزوو دەکات بێتە لامان، تێروپڕ سکاڵای دڵی خۆی بکات و، هەر داخێکی دڵی هەیە هەڵی ڕێژێ، هەر خواستێکیشی هەیە بەسەربەستی بیڵێ..).

سێیەم: ناساندنی هەندێ سەرچاوەی گرنگی زانست و هزرو بیرو ئەدەبی جیهانی: شاکر فەتاح زۆر دەربەستی دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی بووە، ئەویش جگە لە نووسین لە بواری جیاجیای ژیانی کۆمەڵایەتی بە وەرگێڕانی شاکارە بەناوبانگەکانی دنیای زانست و ئەدەب. جگە لەوەش وەکو لە پێشەکی گوتمان، هەوڵی داوە بەها مرۆییە گشتییەکان لە کۆمەڵی کوردەواریدا بڵاوبکاتەوەو، لاوان بە گیانی فێربوون و پێشکەوتن و تێکۆشان ڕابهێنێ. وەختێك لەبەرامبەر چارەنووسی ڕادەوەستین.

ئەم بۆچوونەمان لا دروست دەبێ، کە مامۆستای شەهید لە بیرودەروونەوە لەگەڵ بەرهەمە وەرگێڕاوەکان و بیردۆزە مەزنەکاندا ژیاوە. بیریان ئامێتەی ڕۆحی بووە. هەر ئەو نییە کە (سوکرات)ی وەرگێڕاوە.؟ هەر ئەویش نییە کە (گفتوگۆی گەورە پیاوانی) (باول ئەرنیستی) وەرگێڕاوە کە زۆر بە کورتی هەندێ لایەنی گرنگی ژیان و بۆچوونی هۆمیرۆس سوکرات دیۆجین، ئەسکەندەری مەکدۆنی، زەردەشت، بوودا، کریشنا، فیردەوسی، لیۆناردو دافنشی و، گەلێك کەسانی تری وەرگێڕاوە بۆ کوردی تاکو خوێندەواری کوردی وەك لە پرۆژەکەیدا هاتووە بێبەش نەبن لە ڕۆشنبیریی مرۆیی جیهاندا!! ڕاستە ئەوەی وەریگێڕاون، هەمووی کورتکراوەن، بەڵام زۆر گرنگن، چونکە ڕچکەیەکی تایبەتی بۆ ڕۆشنبیران بڕیوە.

ڕەنگە لە بزووتنەوەی وەرگێڕان و ڕۆشنبیریی ئەو سەردەمانەی (میسر)و وڵاتانی دیکە کەڵکی وەرگرتبێت و بەشێوەو توانای خۆی، وەك زنجیرە بڵاوکراوەی عەرەبیی (کتابی)و (الهلال)و مەڵبەندی بڵاوکردنەوەی لوبنانی هەوڵی داوە شتێك بکات.

ئەمەش-ئەگەر لاسایی کردنەوەش بێ-لاسایی کردنەوەیەکی ڕەواو، چاك و پێویستەو میللەتان بەو شێوەیەلە یەکتر فێربوون! وەرگێڕدراوەکانی شاکر فەتاح لەم بوارەدا، دەچنە خانەی بەرهەمی سەرچاوە، کە خوێندەوار، تەنانەت خوێندەواری باڵاش، لە ژیانیدا پێویستی پێیان دەبێ ژمارەی ئەو بابەتانەی کە وەریشی گێڕاون، هەندێکمان ناوهێنان، هەندێکی دیکەش وەك

کۆنفۆشـوس–سـێر والتــەر ڕالی، ڕیشــیلیو، ڕاســپۆتین، مــایکل ئــەنجیلۆ، ژان ژاک ڕۆســۆ (لــە دوو بەرهــەمدا ئیمیــل و پــەیمانی کۆمەڵایــەتی) و مـۆزار، دیڤـالێرا، لویـس پاسـتۆر، مـادام کـۆری، گاریباڵدی، ئەفلاتوون، چارلسی یەکەم، سۆسان ئەنتونی، ڤۆلتێر، عومەر خەیام. ئەوانە جگە لە گەورە شاعیرو ڕۆشنبیرانی کورد.

چوارەم: بایـەخدان بـە پێشـکەوتنی کۆمەڵایـەتی و نەهێشـتنی نەخوێندەواری، کردنـەوەی قوتابخانـەو نەخۆشـخانەو مەڵبـەندی شارسـتانێتی و. هـەروەها لـە نووسـینەکانی‌دا سـیمای نەتـەوەیی کوردو ئیسلامی دیارن وەك لـە کتێبـی (ئاهـەنگی ڕۆشـنبیران)دا، کۆمەڵێك پەندو ئامۆژگاریی کۆمەڵایەتی و ئایینی نووسیوە، لەگەڵ ئەو تێبینی‌یە کە لـەلای ئەو ئایینی پیرۆزی ئیسـلام کتێبەکـەدا، دەربـارەی (دیموکراتــی) و (مافــەکانی)دا دەڵــێ: (لــە واتــای دیموکراتی و مافـەکانی تێ‌دەگـەین کـە لـەو مافانـە: کۆبوونـەوەو سەربەسـتی قسـەکردن و بـاوەڕکردن و، دەربڕینــی بیروبــاوەڕ لــە بەردەم کاربەدەستانی فەرمان ڕەوادا..)

هـەروەها شـاکر فـەتاح دەڵــێ: (لـە وشـەی دیموکراتی‌یــەوە، واتای: (دادپەروەری) و (یەکسانی) و (سەربەستی) تێ‌دەگەین، کە دەبێ هەموو هاونیشتمانێك وەك یەك، (ماف) و (فرمان)ی هـەبێ و بەرامبــەر دەوڵــەت بــەکاریان بــهێنێ بێجگـــە لـــەوە واتـــای (سوسیالیستی)یش هەر لە واتای دیموکراتی‌یەوە هـەڵقولاوە، کە کۆمەڵایەتی‌یــەکی تەندروســت و خوێنــدەوارو کامــەران و ئــازاد دروست دەکات) لە وەڵامێکی تردا دەڵێ: (ئایینی پاکی ئیسلام بایەخێکی زۆری بە بیروباوەڕی دیموکراتی داوە) لێرەدا چەندین ئایەتی پیرۆزی قورئانی دێنێتەوە بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونەی دەشتوانین بڵێین کە بۆچوونەکانی لـە بـارەی ئیسـلام و ئـازادی و دیموکراتــی‌دا، لــە نووســینەکانی نووســەری (میســری) (خــالید محەمەد خالید) دەچن.

جا: شاکر فەتاح بەو بایەخدانەو گرنگی پێدانە، دەبێ لەگەڵ خـۆی و نووسینەکانی‌دا ڕاستگۆ بووبێت و، ئەوەشی سـەلماندوە، هەر بۆیەش بوو بێ پەروا بەرەو ڕووی مردن چوو.

وەختێك مرۆ هەموو ترسێك بەلاوە دەنێ و، دەیەوێ ئەوە بێ کە دەیەوێ، مەزنترین کاری چاك ئەنجام بدات. بڕگەیەك لـە کتێبـی وەرگـێڕاوی (سـامانێك بـۆ دابـەش کـردن) کـە سـاڵی 1982دا لــە چاپی‌داوە.

لە زمانی قارەمانی چیرۆکەکەوە کە ماوەیەك دوو دڵ بووەو بۆ دەربازبوون لـە دوو دڵـی دەڵێت:. (ئەی چی بکەم؟! بڕیـارم دا لــە پێـش هــەموو شـتێك دا زاڵ بم بەسـەر ترسـداو، دەری پـەڕێنم لـە دڵمدا تێ‌گەیشتم کە زۆر لەوە دەترسام: سەرنەکەوم، فرمـانم لـە دەست دەربچێ، زیان لە سامانم بکەوێ. هـەروەها گـەلێك دوردو ئازاری تریشم تووش ببێ، کە لە نابووتی‌یەوە پەیدا دەبن!

جا لەبەر ئەوەی ترس لـەو شـتانە لـە هـەموو شـتێك گـەورەتر بوو، کە من تووشی بوو بووم، بڕیارم دا کە ئەو شتەی دەتـوانم بیکەم ئەوەیە کە سەر نەکەوم و واز لە فرمانەکەم بێنم، بەبێ کارو فرمان بسووڕێمەوە بەناو شـەقامەکەدا، واتـە: ئەو شتانە بکـەم کە دەترسـام ڕۆژێـك لـە ڕۆژان تووشـم بــبن!! لــە ڕاســتی‌دا ئــەوە دەرمانێکی بەهێزی تاڵ بوو، بەڵام من پێویسـتم بـە دەرمـانێکی بـەهێزی تـاڵی وابـوو، ئامـادەیش بـووم بینۆشـم!) ئـەوە وشـەی دەسخەتی ئەو کتێبەیەبە دەسنووس لە کتێبخانەکەی‌دا دانراوە. نامەوێ بڵێم: کە شەهیدی نـەمر لـە شـتێك ترسـاوە، بەڵام گومـان لەوەدا نی‌یە کە ئـەم جـۆرە ململانێ‌یە دەروونی‌یە تووشی هـەموو مرۆیەك دەبێ.

لەئـەنجامدا شـەهید ئـەو دەرمانـە تاڵـەی نۆشی و (سـوکرات) ئاسـا.. ژارەکـەی نـۆش کـرد، لـەوەختێکدا کـە دەیتوانـی لــەو چارەنووسە هەڵ بێت، بەڵام بەخۆی ویستی بینۆشێ.. تەنیا و لە پێناو دەربڕینێکی بیروڕا.

بیروڕاییێکی ئاوای، لە بارێکی نا ئازاددا دەربڕی، تەنیا کەسێك لە کوردستان و ناوچەکەدا، تـەنیا و تـەنیا لـە پێنـاوی دەربڕینێـك شەهید کرا. بە ژیانی سەلماندی کە ئازادی بیروڕا ئەوەندە مەزنە کە شایانی قوربانی‌دانە.

ئـازادی بـیروڕا سـەرەتاو بنچینـەو مــەرج و کۆڵەکــەی ئــازادی سیاسـی و دیموکراتی‌یـە بـێ ئـەوە ئازادی‌یـەکانی تـر سـەقامگیر نـابن و، هـەر باسـێك لـە دیموکراسـی‌یەوە بکـرێ لاف لێدانێکـی پووچ و بێ مایەیە. بەڵام جیاوازی هەیـە لە نێوان ئازادی بیروڕاو بیروڕای ئازاد، چونکە مەرج نی‌یە هـەموو بیروڕایـەك لـە سـایەی ئازادی‌دا لە مێشکێکی ئازادەوە هەڵقولابن.

هەڵوێستی شاکر فەتاح ئازادیخوازانەو ئازادی پەروەرانە بوو. بـەلام کەسـانێك هەنـەو زۆریـش هەنـە، لــە ژێـر سـایەی ئـازادی سیاسی‌دا ئازادانە بیر ناکەنەوە، بە پێچەوانەوە کۆن دەخنە وزەی بیرکردنەوەی خۆیان و خوێندەوارانەوە.

شــەهید شــاکر فــەتاح، دەتوانـین بڵێـین: شـــەهیدی ئــازادی بیروڕایە.. بەڵام دیسان ڕازێك دەمێنێتەوە بە تـەواوی بدرکێـنرێ ئەویش ئەوەیە: چی بوو کەوا شاکر فەتاحی بەو شێوەیە دوای شــەهادەت خســت، تــاکو گیــانی پــاکی لــە شــەقەی بــاڵی داو دنیای جێ‌هێشت؟!!

هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی شاکر فەتاحی شەهیدی ئازادی بیروڕا دەربڕین و هەموو شەهیدێکی ڕێگای ئازادی کوردستان.

**سەرچاوە:**

**دەستنوسێکی شاکر فەتاحی شەهید، لاپەرە (174-184).**

## شێرکۆ شاکر فەتاح:

# باوکم هەر ئەو ڕۆشتنە بوو، ئیتر نەگەڕایەوە

بە گوێرەی ئەو قسانەی کە دایکم بۆی گێڕاومەتەوە، چونکە لە ساتی ڕوداوەکەدا مــن لــێرە نــەبووم، بــاوکم بــۆ کۆنگــرەی ئودەبــای کــورد لــە هــەولێر بانگهێشــت کرابوو، هەڵبەتە کۆنگرەکە ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم پێش نەورۆز بوو (نەورۆزی ساڵی 1988)، لــەوێ لــە کۆنگرەکــەدا ڕاپۆرتێکــی پێشکەش کــرد بــوو کــە تیایدا بەتایبــەتی باســی لــە بــارودۆخی کوردســتان کردبــوو، دیارە لەو ماوانەدا شەڕی نێوان شۆڕش و حکومــەت گەیشــتبووە بــەرزترین ئاســتی خۆی، حکومەت گوندەکانی بە زۆری چەك، چەکی هەمە جۆری کلاسیکی و کیمیــایی، وێران و خاپور کردبوو، خەڵکەکەی ئەنفال کردبوو، پیرو پەککەوتەو بەشێکی تریشی ڕاگوێــزی ئۆردوگــا زۆرەملێیــەکان کردبــوو، هــەروەها لــە ڕاپۆرتەکــەیدا باســی لــە لــەناوبردن و لەســێدارەدانی ئــەو لاوە زۆرانــەی کردبــوو کــە بــێ تــاوان لــە زیندانــەکانی حکومــەت توندەکــران، دواجاریش داوای لە حکومەت کردبوو کە مفــاوەزات لەگــەڵ پێشــمەرگەکاندا بکــات تاکۆتایی بەو شەڕو ماڵوێرانییە بێت. کە کۆتــایی بەڕاپۆرتەکــەی هێنــابوو پشــێوی لەناو هۆڵی کۆنگرەکەدا دروست کردبوو، هــەندێك کــەس وەکــو دەربڕینــی هەســتی لایــەنگری خۆیــان چەپڵــەیان لێدابــوو، کۆمەڵێکیش لەوانەی لێپرسراو بوون و لە نــاو ئۆرگانــەکانی حزبــی بەعســدا پۆســتی حزبییــان هــەبوو گوتبوویــان ئــەم پیــاوە خەڵــەفاوەو هــەق نییــە ئــەم جــۆرە قســانە بکــات. دوای کۆنگــرە هــاتووبووەوە بــۆ ئوتێل، هەر کە گەیشتبووە ئوتێل کۆمەڵێك لە پیاوانی حزبی بەعسی چووبوون بۆ لای بۆ ئوتێل و داوایان لێ کردبوو ڕاپۆرتەکــەی بگۆڕێت، ئەویش لەوەڵامدا پێــی گوتبوون کــە ئامــادە نییــە دەســتکاری ڕاپۆرتەکــەی بکــات و لــە هیچ کامــێ لــەو بڕگانــەی نێــو نوســینەکەی پەشــیمان نابێتــەوە. چــەند جارێك هەوڵی لەگەڵدا دەدەن، بەڵام سودی نابێت چونکە ئەو هــەر ســوردەبێت لەســەر نوســینەکەی، کــە کۆنگــرە کۆتــایی دێــت دەگەڕێتەوە سلێمانی.

شــەوێکیان ســــەعات (12)ی شــــەو، ئوتومبیلێکــی پــڕ لەچــەکدار دێنــە ســەر ماڵــەوە، بــێ پــرس و لــە دەرگــادان بەســەر دیوارەکــەدا ســەردەکەونە ســەرێ، پــاش ئــەوەی تۆزێــك لــەم دیــوو ئــەو دیــو ورد دەبنــەوە و دەرگــای حەوشــەکە دەکەنــەوە، بەرپرسەکەیان دادەبەزێتە خوارێ و دەڵێت بــەڵکو خــۆت بگــۆڕی و لەگــەڵمان بێیــت بــۆ دائیرە دوو پرسیارمان هەیەو دەتهێنینەوە، ئەویش خۆی دەگۆڕێ و لەگەڵیان دەچێت، ئیتر هەر ئەو ڕۆشتنە بوو نەگەڕایەوە.

هەرچــەندە دایکــم زۆر هــەوڵیدابوو واســتەیەك بدۆزێتــەوە ئــازادی بکــات یــان هەواڵێکی پەیدا بکات بەڵام هیچی دەستگیر نــابێت، ئــەوە بــوو ئــەم هەوڵانــەمان هــەر بەردەوام بوو بەڵام بێسود بوو کــەس بــە دەممانــەوە نــەهات، تەنانــەت دایکــم چــوو بــووە لای جێگــری ســەرۆك کۆمــار (تــەها محێدیــن مــەعروف) کــە خزمیشــمانە، لــە وەڵامدا گوتبووی: من ئەو شتانەم ئاگا لێ نیــەو نــازانم لــە کوێیــەو هــەواڵی چییــە، لەسەرو خۆشمەوە پێیانگوتووم کە ئەگــەر شتێکی ئاوا هاتــە پێشــەوە، واتــە پرسیار یان واستەیان پێکردی، ئەوا هــەقت نــەبێ بەسەرەوەو تەدەخول نەکــەیت. ئیتر ئــەوە بوو دایکم گەڕایەوە، هیچی دەستگیر نەبوو، زۆری نــەخایاند حکومــەت لێبوردنێکــی گشتی دەرکرد ساڵەکەیم بیر نییە کەی بوو، وا بزانم ئەو ساڵە بوو کە کوڕە گەورەکەی سەدام خۆیشی (عودەی) لــە زینــدان بــوو، دیسان هــەوڵمان دایــەوە بــەڵام بــێ ئــەنجام بوو، گوتمان لە ناو چووە، ئیتر دوای ئەوە هیچمان نەبیستەوەو هیچ نازانین.

هەڵبەتە لەدوای ئەمەوە پروپاگەند زۆر هەبوو و زۆر قسە دەکرا، بۆ نمونە دەگوترا لــە خەستەخانەیەکی دهۆکە، پڕوپاگەندەی تریــش هــەبوو، بــەڵام باوەڕمــان بــەو قســەو پڕوپاگندانە نەدەکرد، چونکە بۆ ڕاســتی و دروستی ئەو قسەو پڕوپاگندانە پێویســتە نوسینێ یان بەڵگەنامەیــەك لــە بەردەســتدا هــەبێ، بــەڵام تــا ئێســتا هیچمــان چنــگ نەکەوتووەو کەسیش هیچی پێ نــەداوین، مەگــەر ئێستاو دوا، خۆی دەبوایــە لــەدوای ڕاپەڕینەکــەوە چارەنوســی بــاوکم ئاشــکرا بکرایــە، چونکــە ئــەو شــتانە لــە هــەولێر ڕویــــانداوە، جــــا ئەگــــەر بەڵگەنامــــەو دیکۆمێنتــــی بارەگــــاو ڕێکخراوەکــــانی حکومـــەت و حزبـــی بـــەعس بگیرانایـــەو بپارێزرانایە ئێستا دەمانتوانی بەباش یان بە خراپ لە چارەنووسی دڵنیابین، بەڵام ئەم ساتەیش جگــە لــە هــەندێ قســەی زارەکــی هیچمان پێنەگوتراوە.

